دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
FAMpublication
بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری



چاپی یەکەم - ٢٠٢١

# بە رێی کۆچبارا

نووسینی

## کەریم کاکە

بابەت: یادەوەری

پێوانە

١٣.٥*٢١سم (١٩٠) لاپەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (١٠٢٠)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێ دراوە.

-١-

لەو بەهارە

لە جێی هەر گولاڵەیێ

هەر بنجە گیایێ

جێیێکی کۆچ دیارە

ئەورۆ بە مانــــگ و رۆژی کـــــوردەواری، یـــــازدەی خـاکەلێوەیە، ئاسـمان شـین شـین، جـێ جـێ پەلە هەوری گچکەی سپیات، زەوی کەسک دەچێتەوە، جـێ جـێ تەڕ، جـێ جـێ کـزر، لەو رۆژە، میللەتـێ بە توێشـووی(نا بـۆ بندەستی) بە پێی پیر و زارۆ، وا بەرەو پەنهان بەڕێوەیە.

چاودێ، کۆچبارە، کۆچی دیرۆکی، کۆچە کـۆچ، رێ ناپسـێتەوە، لە سـەری هەورازە نەفـتەوە لـێمەوە دیـارە، تـا دووربین بڕدەکات، رێ لە مـرۆڤ رەشـدەچێتەوە، فیشـەکێ لە هەر کوێوە بێ، بە زەوی ناکەوێ، منـداڵێ، ژنـێ، پیـرێ، کەسێ دەیگرێتەوە.

کۆچبـارە، بەو بەهـارە بە بـن لـوورە و لـرمەی تـۆپی بەغـدای ئەنفالـدا کۆچبـارە، کـۆچی شـارە، هەڵاتنـێکە لە دیرۆکـی نەتەوان بـێ هاوتـایە، ورد و دڕشـت، ئەوەی پێـی گـرت، ئەوەی بە گۆچـان هەسـتاوە، هەسـتا و رێـی گـرت، حەفـت رۆژەی رێـی هەڵاتنـی منـیش بەو رێـیە تـووش و درێژەدایە.

لە ســەر بەردێکـی بەرزایـی ئەو هەورازە بێنـێ دەدەم و بەدەم جغارەکێشانەوە، بەینـێ، بـۆ مـاوەی جغـارەخۆرێ دوو

مژ پتر، بەرێ خۆ دەدەمێ، چ دەبینم من! کەس نەبینێ، کەس وەسەری نەیەت و لە خەونێش رێی بەو رێیە نەکەوێ، هێ لە تیرەی سەدام و رەجەوی.

وێنەی ئەو کۆچە لە زەویەوە ناگیرێ، لە زەویەوە پێشاننادرێتەوە، هەر دەبێ کەسێ بە چاوی ئاسمانی و پەنجەی زەویانە بیکێشێ، کۆچ نە سەری دیارە نە بن، لە رێچکەی مێروولە ناچێ، پانەوپان دێ، رێ هەڵیناگرێ، کۆچ هەڵەت و لارێ دەگرێ، کۆچێکە ئەو کۆچە، دەزانێ لە کوێوە دێ، لێ نازانێ بۆ کوێ دەچێ، بۆ چ وارێ سەرهەڵدەگرێ.

ئاسمانی شار چڕە دووکەڵێکە لە گەواڵە دەچێ، لوورەی تۆپیش دەشت و بانی و زوورگان دەبڕێ، ترسێکی وا لە دڵان دەنێتەوە، نە بە من نە بە چ کۆچنووسێ نانووسرێتەوە، ترسێکی وا ساوا کە هێشتا نازانێ دەست و پاروو بۆ زاری ببات، دەزیڕێنێ و بە هەردوو دەستان توند گوێی خۆی دەگرێ، خۆی لە ئامێزی دایکی رادەپسکێنێ، رەنگە تۆی کۆچنەدیو، کۆچی لەو رەنگە، باوەڕ بەوە نەهێنی، لێ ئەز لەو کۆچە لە نزیکەوە ساوای وام بینی، کۆچی نەتەوە وێنەی وای تێدایە، چ وێنەکێشێ خەیاڵی بۆ

تـابلۆی وا نـاچێ، زیـڕەی وای تێـدایە، مووسـا ببیسـتێ، گازەندە لە خوداوەندی خۆی دەکات و ئـایەتی تـازەی لـێ دەخوازێ.

ئەز لەو هەورازە کـــۆچە، ئەو کـــۆچەی بە شـــێوەیێ کەوتەوە، کەس بیـری لێنەدەکـردەوە، چیرۆکـی کـۆچی مووسـا و جـووم بیـرکەوتەوە، ئەو چیـرۆکەی لە هەنـدێ زارەوە، هێنـد بە دڵـوداو و تـرش و خـوێ پێـوەکردنەوە بیستبووم، بە دەست خۆم نەبـوو، بە وێـنەی ئەو کـۆچەی وا خـۆمی هەڵگرتـووە، گـرتە گـرتە بە راسـتی تێگەیشـتبووم، نەخاسمە لە زاری پلکە زارێی بنجووەوە:

ئەها، خوداوەند، خوداوەندی دەریا و سـارا، لە ئاسـمانی کێوی توورەوە بە هاناوە هات... مووسـا دەبیـنم بە دارەکەی دەستی، هێندەی بلـێ یەک و دوو دەریـا کەرت دەکـات... تیـرەی مووسـا بە ورد و درشـت دەپەڕنەوە، پـاش پەڕیـنەوە هەردوو کەرتـی دەریـا تێکـدەکەنەوە، ئەوان دەربـازدەبن، پیرعۆنی میسرێ و سوپاکەی تیادەچن...

ئەدی ئـێمە، خوداوەنـد و دارێکـی وا لە کـوێ بهێـنین؟ پیرعـۆنی،بەغـدایێ لە زەوی و ئاسـمانەوە بە دوامـانەوە، بە

سەرمانەوە، ئەو سوپایەی ئێمە راودەنێ، کار لە سوپای پیرعۆن نیە، لە تیرەی کوڕەکەی ئەبۆ سۆفیانە، سوپا، سوپای ئەنفالە، چ خوداوەندێ ناکارێ پێشی پێبگرێ، لەشکری پیرعۆن لە چاو ئەنفال بە ئاوی نیل و دەچلە و فڕەهات، بە ئاوی دلۆپە شۆڕاوەتەوە، داری مووساش دادمان نادات.

لە دلێ خۆم ئەو گۆتەیە دەلێمەوە کە کورد لەوەتەی هەیە دەیلێتەوە:

چیا، چیا، تەنها چیا پشت و پەنا.

چەندێ لە چیا نزیکبیتەوە، ئەنفال هێندە دووردەکەویتەوە.

ویدەچێ لەبن لێوانەوە گوتبێتم:

بریا شاری مە لە بن چیا با.

بۆیە دەلێم رەنگبێ وام گوتبێ، چوونکە هاوڕێ کوردەکەم گوتی:

داری بریا بەر نادا، شاری دوورە شاخ ئاسان دەکەوێتە زاری ئەنفالەوە.

هاوڕێ عەرەبەکەشم گوتی:

باش بوو وا گەیشتینە چیا، لەشکری نامانگاتێ.

بۆ لەبیرنەچوونەوە دەڵێم من لەو کۆچە دوو پێشمەرگە دوو هاوڕێم لە تەنیشتە، عادل، عارەبی لای بەغدایێ و قاسم، کوردی لای کەرکووکێ.

ئی، منیش تا نەگەیشتمە کانیی دڵۆپە، ترسی بە دەست گرتنم لە دڵ نیشتبوو، ئاخر لەو دەشتە رووتە کە وێنەی ناو لەپی دەستە، هەوێردەش ناتوانێ خۆی لێ بشارێتەوە، ئەگەر لە دوو کۆپتەرەوە سەربازی ئەنفال دابەزیبان، بە زیندووییش قیڕەبڕ نەکرابایین، بە مردوویی دەگیراین، ئاخر چ چەکدار نەمابوون، بە پێشمەرگەوە جاشەوە قووچاندبوویان و شارێکیان بۆ ئەنفال بەجێهێشتبوو، ئا، جاشیشم دەدیت هەڵداهات.

لە کانیەکەی دڵۆپەوە ترسی بە دەست گرتن رەویەوە، لێرەوە، بانی و گرد و زوورگ و تەلان دەستپێدەکات، کۆپتەریش بۆردومان بکات، دەتوانی لە بن بەردێکەوە چەند فیشکێ بهاوێژی و خۆ بشاریەوە، ئەوە من چ دەڵێم، دین بوومە؟

نەتەوەیەک ورد و درشت، بە نێرینە و مێینەوە، بە دین دەرۆزەکەرەوە، وا لە کۆچە، دە هێندەی ژمارەی دار و بەردی ئەو ناوە بنیادەم بە ڕێوبانەوە، سەنگەر گرتن و پەنا بەردی چی! فیشەکێ ڕووەو ئێرە بە ئاسمانیشدا بهاوێژرێ، ناکەوێتەوە زەوی، بێ سێ و دوو، کەسێ سارددەکاتەوە، تۆپێ لە هەر کوێوە هەڵدرێ و لە کوێ بکەوێتەوە، ئەگەر نەشتەقێتەوە، بایی گۆڕستانێ مرۆڤ پەلەواژدەکاتەوە، خۆ ئەگەر -گوێی سەدام کەڕ بێ- عەلی کیمیاوی فڕۆکەیێ بنێرێ، بە سەر ئەو ڕێوبانەدا دەرمانەکە هەڵڕێژێ،(دلۆپە) بە دەردی (عاشقان) دەچێ و ژیان هەناسەی لێدەبڕێ، چکدەکات.

پیاوێک بەرانپیلێکی گەورەی پڕی بە کۆڵدا دابوو، منداڵێکیش بە ئامێزیەوە، دەمدیت ناوە ناوە بە سەری دوو پەنجەی فرمێسکی منداڵەکەی دەسڕی و سەری بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی، گوێم لێیە دەڵێ:

ئەو فیرعەونە بەس دەرمانەکەمان پێوەرنەکات، ئەویدی هیچ نیە.

تۆ بڵێی سەدام، دیسان کیمیاوییەکەی ڕاسپێرێ؟

وا چاکە چیدی بیر لە کیمیا نەکەمەوە، دەنا چۆکم دەشکێ و دەست بە خۆمدا شۆڕدەکەمەوە، لە سەرمە شنگ وتین بدەمەوە بەر خۆم و دەسبەرداری ئومێدی دەربازبوون نەبم، هێندەی لە دەستیشم دێ، دەستی هانام درێژ بێ و بە هاناوە بچم.

ئەوەی لێرە لە دەستماندێ، چوونە بن پیلی پەککەوتەیی، لە باوەشکردنی مندالێ، پالدانی عارەبانەیەک... هێندە و تەواو، چاودێ، قاسمی هاوڕێم مندالێکی لە باوەشە، مندالە حریت حریت پێدەکەنێ، وا دیارە قسەی خۆشی بۆ دەکات، یان ردێنی دری بە روومەتی ناسکیدا دادەهێنێ، روومەتێ دەلێی ئەو گولالە سوورانەیە، تازە بۆ خاکەلێوە لێو دەکەنەوە و وا لە بن پێی کۆچدا پەڕ پەڕ دەبن، بیرمە مندالەکەم لە هاوڕێکەم وەرگرت:

کچە جوان، ناوت چیە؟

بزەیەکی شیرنی کرد:

ناوم گولالەیە.

وا دیار بوو ئامێزی هاوڕێکەمی پێخۆشتر بوو، چاوی هەر لە سەر وی بوو، ئەوەشم لە بیرە گۆتیە دایکی:

دایە، ئەو پیاوانە خزمی ئێمەن؟

دایکی گوتی:

کچم، ئەورۆ هەمووومان کەسوکاری یەکین.

وای، گوڵاڵەی بەهاری هەورازە نەفتە، چەند لە ناسکی هاوینی هەورازەکەی ئەودیوەی دۆڵەڕەقە دەچوو، ئەوەی لە ئەنفالەکەی هاوینی هەشتاوهەشتێ، ئەوەی بە ئامێزمەوە لێوی ناسکی بە مەتارەکەمەوە نابوو، ئەو ناسکەی گوڵەستێرەیێ بوو، نەمزانی لە کوێ کوژایەوە، وای کوردا تۆ هەر بەشت کۆچە! کۆچەکەی هەینێ، کۆچی ناسک، کۆچی چەند گوندێ بوو، بەڵام کۆچی هەوکە، کۆچی گوڵاڵە کۆچی شارە، کۆچی نەتەوەیە، نزادەکەم گوڵاڵە بە دەردی ناسک نەچێت و نەکەوێتە زاری ئەنفالەوە.

لەو هەورازەیە، عادل عارەب بە تەنیشت پیاوێکەوە پاڵ بە عارەبانەیەکەوە دەنێ، هەندێ پرێسکە و هیربار و سێ چوار منداڵی سەرکەوبنکەی لە سەرە، کەرێکی ماندوو لە

کـــورد مانـــدووتر رایدەکێشـــێ، جلەوەکەشـــی بە دەســـتی ژنـێکەوە، ژنە فـۆتەیەکی رەنـگ گیـایی لە سـەرە، ژنێکـی رەقەڵەی چـاو بە قووڵـدا چـووی رەشـتارە، لە کەرەکە پتـر ماندوویێتی پێوە دیارە، وایـش! کەر کەوت، دەورمـان دا، بە هەشت دەستان هەڵنەستاوە، کەری بەستەزمان بە چاو دەیگۆ: خۆ ماندوو مەکەن...

پیاوەکە عارەبانەکەی لێکردەوە، کەر جـوولەی لە خـۆی بڕی، ئەورۆ نیە بیسـت رۆژە گیـانی سـپاردووە، رایانکێشـایە رۆخ ڕێ.

ژنە بە لچکی فۆتەکەی باوەشێنی دەکرد، بادیە ئـاوێکی بە دەموچاویـــدا کـــرد، چەنـــدی خـــۆی بەلاگێـــری کەری راکشاو کرد، پیاوە چەندی پێیگوت:

کەرەکەم، کەســەکەم، پیــاوی چــاکبە، لەو رۆژە رەشــە ئەوەم لەگەڵ مەکە، هەسـتەوە، مەمـانکە خـواردنی گـورگی دوو پێ...

کەر چەند جارێ نیو هەڵێنانێ چاوی هەڵێنا، من ئەوەم لە چاوی خوێندەوە:

رۆژم هاتووە، ئێرە جێمە، بەجێم بهێڵن.

پیاوەکەش هەر وای خوێندەوە، بۆیە خۆی چووە جێی کەرەکە و ژنەکەش لە دواوە پاڵی پێوەدەنا.

دوا هەناسەی کەرەکەم بیرناچێتەوە، لە کونە کەپوویەوە بە شێوەیێ هەناسەی دەدەدا، شەرواڵی ماخۆکەی بە با خستبوو.

لەو رێوبانە کەر و عارەبانە لە ترومبێل پترن، داخوا چەند کەر پەکی کەوتووە؟

گرتەیێ هەیە، ئەگەر تووشی لەبیرچوونەوەی تەواویش بم، لەبیرمناچێتەوە:

پیرێژنێ کە هەر هێندەی گلۆلە بەنێکی لێماوەتەوە، ترسی ئەنفال نەبێ، لە سەر جێوە ناگاتە سەرئاویش، بە چاوی من نا، بە هی خۆت چاویدێ، هەوساری چێلێکی بە دەستەوە، چێلێ باریٚ بە سەربارەوەی بە پشتەوە، لە جوولەیرا وێدەچێ لە گەڵ بار رانەهاتبێ، چەند جاریٚ دیتم، پیرێژن ئاوڕی لێدەداتەوە، بۆی دەگەڕێتەوە، دوورنیە پێبلێ:

رادێی، مارەباب، رادێ.

پیرەمێردێکی ڕەقەڵەش کە دەڵێی سیرمەیە، قیت قیت لە دوای چێڵەکە دەڕوات و ناوە ناو بە دەم (وەحە...)یەکەوە، قوتە گۆپاڵەکەی دەگەیەنێتێ، گوێم لێبوو، پیرێژن گوتی:

پیاوەکە، نەرم لێیدە، نەیئێشێنی.

ترومبێلەکە تێکیدا، دەنا من حەزمدەکرد پێ بە پێ، بە تەنیشت ئەو ژن و چێڵ و پیاوەوە ڕێی کۆچوبارم گرتبا.

لە تەنیشتمانەوە، ترومبێلێکی گچکەی سەرکراوە کوژاوە، سەری لە ژن و منداڵ زەرد و سۆر دەچۆوە، لە دوورەوە لێت ڕوانیبا، لەوە دەچوو مێرگێ گوڵی هەمەڕەنگی بارکردبێ، هەندێکیان دابەزین و کەوتینە پاڵپێوەنانی، ترومبێل هەڵنەبوو نەبوو، ئێ، لە ترومبێل گەڕێ، وێناچێ جارێکیدی گڕەی لێوەبێ، لەو سەربردەیە ئەو ژنە سەرباسە کە بە دیار ترومبێلەکەوە لە کەلێنی وردە فرمێسکانەوە تیچاوێکی لە سەر منە و نایگوازێتەوە، ژن، دەستە ژنی بەژن باریکی چاو گەشی رووخسار لەشێوەی زولفی ژاکاو، لە بن فرمێسکەوە جوانیەکی بەسەرچوو دەتریسکێتەوە، ئەو ژنە وێدەچێ بەر لە چەند ساڵێ لەو جوانانە بووبێ کە بە نیگایێ پیاوی مەست و سەرگەردان کردبێ، ئەرێ بۆچی چاوی لە

سەر من هەڵناگرێ، رەنگە بە کەسێکم بچووێنێ، منیش بۆ تاوێ چاوم لە چاوی پڕ لە رۆندکی بڕی، رووی وەرگێڕا، دەڵێی دەیناسم، ئا، من ئەو ژنەم دیوە، لە کوێ؟ بیرمناکەویتەوە، ویستم شتێکی لێ بپرسم، نەمپرسی، هەستمکرد ئەویش قسەیەکی لە دڵە، نەیکرد، عادل گوتی:

وا باشە بڕۆین، هیچمان لە دەست نایێ.

وایە، شتێکی لێ نازانین و بە ئێمە وەگەڕناخرێتەوە، جغارەیەکم پێچایەوە و رۆیشتین، بەڵام ژنەکە وێنەیەک بوو بەر چاومی بەرنەدەدا، لە خەیاڵم لانەدەچوو، وێنای دەکەم و بیرمناکەوێتەوە کێیە و لە کوێم دیوە، کۆپتەرەکان لە خەیاڵی ژنە فرمێسکاویەکەیان کردم.

-٢-

کەمانی شکاو

ئاوازێ بۆ کۆچ دەخوێنێ

ئاوازی لە تەل پچڕاو

لە ناورانەوەی کۆتر دەچێ

لە بەرزایـــی هەورازی ســـەخت و رژد، ئەو هەورازەی ئەورۆ خـۆی چەنـد قـات هەوراز کـردەوە و لەم بەهـاری کۆچە، بایی چەنـدان هـاوین ئـارەقەی بە کۆچوبـار رشـت، لەوێ، بەر لەوەی بەو دیـودا شـۆڕبینەوە، رێـک لەو بـن گـردەی پاشـتر، پاشـوەی پێشـمەرگە جـاش تێکەڵبـوونەوە! جاشـێکی نـاوبەد، کۆشـک و تەلاری لـێ بەرزکـردەوە، جاشێك چەندان ساڵ بوو، لە بەرەی لەشکری ئەنفال بوو.

لەوێ، لە ئاسـمانی خـاکەلێوەی ژاکـاوی ئەوێ، سـێ چـوار کـۆپتەر پەیـدابوون، نەوی، نەویتـر لە دوورایـی ئارپێچی، بەڵام بە چی دەچێ! لە سـایەی بەرە، ئەو بەرەیەی کلکی دە گەلۆزێ نا و بە پێی تـاژی هەڵات، ئارپێچیهـاوێژ ما؟! ئەگەر مابێش، نـابێ، یەک تەقە رەنگبـێ بە کوشـتدانێ سەد کەس بێ.

ئەو خەڵکە ورد و درشت هەر کەسە و لە جێـی خـۆی دانیشـت، لە سـەر زگ، لە سـەر پشـت، لە سـەر تەنیشـت راکشـا، نە گـرەی ترومبێـل، نە گـریەی منـداڵ نە نـزا و پاڕانەوەی ژن، نە جوێن و تفی پیر، نە دەنگی پێ دێ، هیچ هیچ نەما، زەوی نووزەی لێبڕا.

چـاودێ، میللەتێـک لە دەشـت و دەر و گـرد و دۆڵ و

تەلان و بن گەوەڕ و کەندڕان کڕ کەوتووە، لە شێوەی مەڕ مۆڵ بووە، هەموو دەستمان لە سەر دڵمانە، کۆپتەر ئەگەر لەو ئاسمانەوە بێ دیتن و سێرەگرتن، هەر لە خۆوە بڕشێنێ، خوێن هەڵدەستێ، ئەو جۆگە و چەمە بەهاریانە دەبنە زێی خوێن.

ئێمە هەر سێ هاوڕێکە و سێ چوارێکیدی پشتمان بە تەلانێک داوە و دەستەپاچانە چاومان بڕیوەتە گەڕ و سووڕانەوەی کۆپتەران، ئەرێ کۆپتەر بوون یان فڕۆکە؟

عادل تفەنگی سوارکرد، گوتم:

هەڵەی وا نەکەیت.

گوتی:

دەزانم، خۆ شێت نیم، بەڵام سوارم نەکردبا، دڵم دەتەقی.

قاسم مستێکی لە چەکەکەی دا و روو لە کۆپتەرەکان:

دەستی ئەو خەڵکەم شکاوە، ئەگینا ئێوە ئەوەن بەو شێوە نزم بفڕن و گاڵتەمان پێبکەن؟!

لە تەنیشتە من کوڕێژگەیەکی پرچ لە سەر شان،

پرچێکی جوان، کچ خۆزیی پێدەخوازێ، پشتی بە تەلانەکە داوە و کەمانێکی ناو قەد کچانیی توند لە ئامێز گرتووە، تیچاوێکم کەوتە سەری، لێوی دەجوولا، هەستمکرد نزا دەخوێنێ، گوتم:

مەترسێ، هیچ نابێت.

راستی منیش زۆر دەترسام، بەڵام بە سەر خۆم نەدەهێنا.

ئەز چاوەڕێی ویرانبوونی دنیام، ئاخر پێموابوو، ئەگەر ئەو کۆپتەرانە ئەو ڕێوبانە بۆردمان بکەن، ئەو کۆچە دەبێتە کۆچی دوایی و هەموو پێکەوە، بە رووباری خوێنەوە، دەگەینە ئەو دنیا.

گوێم لێیە کەسێ دەڵێ:

مەترسن، ئەو کۆپتەرانە بۆ کوشتنمان نەهاتوون، دەیانەوێ بگەڕێینەوە.

تۆ بڵێی وا بێ؟

قسەی خۆش هەر خۆشە، ئاهێکم هاتەوەبەر، ئەها، کۆپتەر بزربوون، چوونیان بێ و هاتنەوەیان نەبێ، ئەز

لەوەتەی بە چیا کەوتووم، بیرمنایێ کۆپتەر لە سەرمان سووڕابێتەوە و ئاگر و ئاسنی بەرنەدابێتەوە، ڕەنگبێ پیاوەکە شتێکی لێزانیبێ.

لەگەڵ نەمانی دەنگ و گڕەی ئاسمانێ، زەوی کەوتەوە جووڵە، کاروانی نەتەوە بە پێی پیر و منداڵ و کەری ماندوو کەوتەوە ڕێ.

بەوەی باشە، خاکەلێوە بە ئاوە، کاروان لەوە بێ خەمە، سەر بە هەر شوێنێکدا دەکەی، گۆمیلکە و هەرکەوی پڕ ئاوە، کەندەکەی دیوی دێی باخچە خوڕەی دێ، نانیش، هەر خێزانێ بگری، توورەگەیێ، بەرانپیلێ نانی بە دەست و کۆڵەوە، تەنێ ئێمە بێ نانین، دەبوو بە قسەی دایکم کردبا، یەک دوو نووردووە نانم هەڵگرتبا، باشە بۆ پێڵاوێکی باشترم پەیدانەکرد؟ ئای لە بێ مێشکی!

ئەز بەری بیست و حەفت ڕۆژان، لە ناوەڕاستی ڕەشەمێ، لە بەفری ناوزەنگەوە دابەزیم، خاکەلێوە شەوێکی مابوو بۆ لێو کردنەوە لە ناو گڕی بابەگوڕگوڕ نیشتمەوە، هەینێ چۆن بووم، هەوکەش هەر وا، لە دوورەوە دەناسرێمەوە، هەمان جلکوبەرگ و ساقۆ و جەمەدانی، پێڵاو

و پشــتێن و فیشــەکدان و کۆڵەپشــت، تەنهــا تفەنــگەکەم گــۆڕاوە، ئەوەی کــۆن لە کــار کەوت، ئەمەم لە خزمــێ وەرگرت، ناو کۆڵەپشتەکەشم دەستی لێنەدراوە، نەینـۆک و تاخم تـراش و کەرتـکە سـابوونێک و کراسـێکی گەچـراو، کیسەیێ تووتن و ناڵەی جـودایی هێمنیشـی تێـداماوە، ئـای! رادیۆکەم نەهێناوە.

بڕۆ لەگەل کۆچی نەتەوەدا، ریێ و ریێ، دەو ریێ و ریێ، بڕۆ.

لە نشێوەکە، ئەوەی بە سەر ئاقاری بـاخچە شـۆڕدەبێتەوە، کوڕە پرچ درێژە کەمـان لەدەسـتەکە تـا ئەولاتـریش هەر لە شــانی ئـێمە دەڕۆیشــت، لەوێ، لە تەلانە زیــخەڵانەکە پێــی خــزی و بە کەمــانەوە چەنــد تەقلەیەکــی لێــدا و خــۆی پێنەگیرایەوە، سێ چوارێ زوو گەیشـتنێ و هێنایـانەوە سـەر ڕێ، کــوڕە نەرم نەرم دەگریــا، هــۆن هــۆن فرمێســکی دادەباراند، وێدەچوو گریانەکەی نیوەی بۆ کەمانەکەی بێ، شکابوو، نیوەشی بـۆ دایـک و بـاوکی بـێ، بەجێیهێشـتبوون، بەر لەوەی لێمان دابڕێ، لێمپرسی:

چۆنە بە تەنێی، ئەدی....؟

گوتی:

دایــک و بــابم چــوونەتە تەمەنەوە، ترۆمبێلــێ نەبــوو هەڵیانگرێ، لە ماڵێ مانەوە، منیشیان بە زۆر بەڕێکرد.

کەمانە شکاوەکەی بە دەستەوە گرت و پارچە ئـاوازێکی شکاوی ژەند.

لەو ناوە لێکدی دابڕاین و نەمدیتەوە و نەمزانی بە خـۆ و کەمانی شکاوەوە گەیشتە کوێ.

لە راسـت بەرزاییـەکەی دەسـتی راسـت، ئەو جێـیەی لە بەهارێکی وەک ئەو بەهارەی کـۆچ، بەر لە حەڤـدە سـاڵێ، دەستەیێ پێشـمەرگە دەور دەدرێـن، دوای شـەڕی دەسـتە و یەخە، دەکەونە بن زنجیری دەبابەوە، کەسوکار بە جەمەدانی و پـێڵاو تەرمەکانیـان ناسـیەوە، ئـا، بـۆ خوێنـدنەوەی ئەو نەبەردیە، بـۆ سـەرە کۆلانێکی(کـۆلان کـۆلان گێـڕانەوە) بگەڕێوە.

لە راسـتی ئەو جێـیەی نەبەردی، ترۆمبێلێکـی دارمـاڵ لە چەکدار، دەنگی(وا هاتن پێشـمەرگێت مە)یـان دابـوویێ، بە دید دیدی نەپساوە، رێی هەڵاتنیـان دەکـردەوە، تێنەگەیشـتم پێشمەرگە بوون یان جاش، پێشتر با، پـێش چەنـد رۆژێ، لە دەمــی راونــانی لەشــکری ئەنفــال، ئاســان دەناســرانەوە، پێشــمەرگە بە جلکــوبەرگی شــڕ و پــێڵاوی لاســتیق و

ئەدیـــدایس و کۆڵەپشـــتەکەی و دژویتـــی و چلکنـــی دەناســـرایەوە، بەڵام لەو چەنـــد ڕۆژەی ئـــازادی، هەنـــدێ پێشمەرگە لە جاش پاکژتر و پۆشتەترن، بـۆیە لەو هەڵاتـنە، لەو کۆچە کە لەشکری ئەنفـال میللەتـێ ڕاودەنـێ، ناسـینەوە ئاسان نیە.

لەو ساتە، کچێـک پێڕانەگەیشـتبوو خۆشـی بگـۆڕێ، بە توێی کراسێکی ئاودامانەوە، ڕێی کۆچی گرتووە، دەستێکی بە لاکەڵەکەیەوە، بە دەنگـی بەرز ڕوو لە چەکـدارانی نـاو ترۆمبێـل دەسـتی بە جوێنـدان کـرد، هەرچـی دەهـاتە سـەر زاری نەیدەگێڕاوە، من باوەڕمنەدەهات کچێک لەو ڕێیە ئەو هەموو جوێنەی هەڵگرتبێ:

کـوڕی گەوادیـنە، قوونـدەرینە، قۆنـدەرەینە، گەمبـۆرینە، پێشمەرگەی ناکەسبەچەینە، داک حیزینە... ئەو خەڵکەی لـۆ بە جێدەهێلن؟ هەر یەکە و دوو فیشەکان بتەقێنن، حوکمەت دەگەڕێتەوە.

هاوڕێ کوردەکەم گۆتی:

نەڵێن شێتە، دوو دەسترێژ بەو جاشانەوە دەنێم.

گوتم:

به چی دەزانی جاشن؟

گوتی:

پێشمەرگەش بن، بەو دیددیدە بوونە جاش.

هاورێ عارەبەکەم پرسی:

ئەوە چ دەڵێ؟

گۆتم:

دەڵێ: با ئەو چەکدارانە بکوژین.

بە نیوە بزەیەکەوە:

دیسان براکوژی!

ئێ، لە جوێن و توورەیی کچەوە، نەمدەزانی تفەنگ و فیشەکدانم لە کوێ بشارمەوە، لەوێ هەستمکرد، پێشمەرگە شەرمەزاریە، شەرمەزاریەک تەنها بە خۆکوشتن لێی پاکدەبیەوە، چەند حەزمدەکرد هێندە زاخەم تێدا با، فیشەکێکم بە خۆمەوە نابا.

تـا گەیشـتمە ئێـرەش، گەیشـتمە بـن بەردەکەی ئیمـامی عەلـیش، چـاوەڕێ بـووم بەرە، بەرەی هەڵاتـووی دۆڕاو، خڕبێتەوە و لە سەر ئەو گردانە سەنگەر لێبـدا و بەر سـینگی لەشکری ئەنفال بگرێ کە تا ئێستاش ئەو لەشکرە لە هـیچ شوێنێکەوە دیار نیە، تەنها لە دوورەوە لـوورەی تـۆپ دێ و لە ئاسمانیش ناوە ناوە گڕوهۆڕە.

بەر لە هەڵگەڕان بـۆ بەردەکەی ئیمـامی عەلـی دوو سـێ گرتەم لەبیرماون:

شێتێ لە شانی دەرۆزەکەرێ هەڵتـک هەڵتـک کەوتـۆتە ڕێ، وێدەچێ ناسیار بن، دوو سێ جار دیتم، سەریان خستە بن گوێی یەکتر، شێتە کوڕێکە لە تەمەنی من، بەر لەوەی بە چیـا بـکەوم، ئەو شـێتەم لە شـار نەدیتبـوو، ئەگەر هـی شـوێنێکیتر نەبـێ، دوای بە چیـاکەوتنی مـن ئەو بە جـادە کەوتووە و شێت بووە، شێتە، ناوە ناوە سەر بەرزدەکاتەوە و ئاسمان بەر تف دەدات، ئاوڕدەداتەوە و دەڵێ:

هات، هەرێ هات، سەدۆ هات، عەلۆ هات.

لێرە تا ئێرێهـێ غـار دەدا، لە جێـی خـۆی رادەوەسـتێ و ئاسمان بەر تف دەداتەوە و دەچێتەوە تەک دەرۆزەکەرەکە،

ئەو(هەرێ هــات)ە تەنهــا لە زاری شــێتەکەوە نــا، لە زۆر زارانەوە بە گوێی کۆچوباردا هەڵدەدرا، منـداڵ هەبـوو تـازە زمانی گرتبوو، بە کۆڵی دایکیەوە دەیگۆ:

هەرێ هات، مجاهید هات.

دەرۆزەکەرەکە ژنێکــی ســەر چەنەگە و لا لێــو و ســەر روومەت کـوتراو بـوو، بە دەم رێـوە جـوان بنێشـتی دەجوو، وەک بڵێی لە جادەی باتە بێ و بچێ، چەند جـارێ دیـتم، شـانی کەسـێکی دەگـرت و دەسـتی پانـدەکردەوە، هەبوو خۆی لێ توورە دەکرد، هەبوو ئاوڕی لێ نەدەدایەوە، کیژۆڵەیەکی پارچەڵە نیودرهەم بوو یان درهەمێکی دایێ.

هەر لەو دۆڵ و دەو کەنــــدە، لە ســــەر عارەبــــانەی تراکتۆرێکەوە پلکە زارێـم دی، ئەویـش منـی ناسـیەوە، ئەو زارێـیە دەڵـێم کە کـۆچ و گۆچـانەکەی مووسـای جـوان دەگێڕایەوە، باب و داکی زارێ زوو، لە سـەردەمی کـۆچی جــوو، ساڵی پەنجـا و یەک و دووی ســەدەی رابــردوو، سـەردەمی شـاربەدر و وڵاتـبەدەری جـووانی کوردسـتان، لە شار مانەوە و بوونە موسڵمان، بەڵام ئـۆل گـۆڕینەکە لەگیـنە تەنهـا بە نـاو بـووبێ، ئـاخر نە خۆیـان و نە زارێـی کچیـان،

نیشانەی موسڵمانێتیان پێوە دیار نەبوو، هەبوو دەیگۆ:

پلکە زاریێ بنجوو نیە، هێشتا هەر جووە.

خۆ منداڵەکانی پلکە زاریێش کە بابیان پێیەکی هەر لە مزگەفتێ بوو، هێندەی چووبوونەوە سەر جوو، موسڵمانێتیان پێوە دیار نەبوو.

دایکم لە بارەی پلکە زاریوە دەیگۆ:

بیشیسووتێنی شەمووان ئاگرناکاتەوە.

لە حەمەد مەستانم بیستبوو:

دینی جووان لە دینان جودایە، وەک زمان وایە، منداڵ لە دایکەوە بۆی دەمێنێتەوە.

پلکە زاریێی نازانم جوو یان بنجوو، دەستی بۆ راوەشاندم و هاواری لە شوفێرەکە کرد راوەستێ، خۆ هەمووش لە سەر کۆش و شانی یەکتر دانیشتوون، جێی مریشکێکیش نابێتەوە، بە ئاماژەی دەست تێمگەیاند رانەوەستن و برۆن.

ئا، ئێمە هەر زوو هەرێمان بە خۆمان دابوو، بە پێی

کـاروان بـڕۆین و کۆچوبـار بەجێنەهێلـین، بەڵام وا بـڕوات عـادل پەکـی دەکەوێـت و دەکەوێـت، ئەو پێشـمەرگەیە لە ڕۆیشتنێ زۆر بەکێش بوو، من بەر لە چەنـد سـاڵێ لە بەری بادینـان، لە چیـای سـەختی پێـرس و کـۆرس لە ڕێوبانـان لەگەڵـی بـوومە، دەزانـم تینـی سـێ ڕۆژە ڕێ ڕۆیشـتنی بـێ ڕاوەستانی تێدایە، بەڵام وا دیارە، پێێ تەواو نیە، با بزانین...

لە بن هەورازەکە گۆتمە عادل:

ئەگەر تڕومبێلێک هات، بواری خۆپێوەکردن هەبوو، خۆ پێوەکە.

گوتی:

ناتوانم بەجێتان بهێلم، ئێوەش وا بکەن.

گوتم:

خەمی ئێمەت نەبێ.

گوتی:

بشمێننەوە، هیچتان لە دەست نایێ، وا چاکە پێکەوە...

قاسمیش هاتە ناو قسان و گوتی:

هاوڕێ، پێویستە تۆ بڕۆیت، بکەویت، ناتوانین هەڵتگرین.

لە بەختی عادل لۆریەک هات، کەلێنێکی دیتەوە و خۆی پێوە هەڵواسی، ڕۆیشت، تا بزریش بوو، ئاوڕی دەدایەوە و بە تێکەڵەیەک لە عارەبی و کوردی:

ڕەفیق شوانە، ئێوەش، تەعالو...

پێناچی وەها زوو عادل ببینمەوە، بۆیێ با پێکەوە پاش کۆچەکە هەواڵی گرتنی ببیستین و ئیدی ڕەنگبێ چیدی نەیەتەوە ناو گێڕانەوە:

عادل بۆ کاری پارتایەتی بە نهێنی دەگەڕێتەوە بەغدایێ، لەوێ دەگیرێ، لە کونەڕەشەی دەپەستن و کوتکوتی دەکەن، بەڵام بەرگە دەگرێ و نامرێ، چەند ساڵێ لە تەمەن لە کونەڕەشەی بەعس دەباتە سەرێ، پاشان بە پەڕجووێ کە ناوی لێبووردنە دێتە دارێ، ئەویش ڕێک بە دەردی ئەبوو سۆسەن دەچێ، ئەو هاوڕێ عارەبەی لە ڕەشەمێ لە راونانی لەشکری ئەنفال لە ناوزەنگێوە تا بابەگوڕگوڕ بە یەکەوە بووین.

ژنێ بەرۆکی خۆی دادەدڕی و پیاوێ لە سەری خۆی دەدات، دەبێ چێ قەومابێ؟

ترومبێل بەنزینی نەماوە، ئەوە چەند رۆژە بەنزین قاتە، چەکدار و درِ نەبێ بەنزین دەستناکەوێ، دیتم دوو ترومبێک رایانگرت، هەر یەکەو چەند چۆڕێکیان لە هی خۆیان هەڵهێنجا ورۆیانکردە ترومبێلی کوژاوە، ژنە و پیاوە خەنی بوون، لەو رێیە دوو سێ گرتەی وام دی، بە هانای بێ بەنزینانەوە دەچوون و بەجێیاننەدەهێشتن.

دوا وێنە لەو شوینە لە چاوم مابێتەوە، ئەوە بوو:

لە نزیک ئێمە کوڕێکی چوارشانەی بەخۆوە ژنێکی وردیلەی بە کۆڵەوە بوو، ژنە دەیگوت:

کورم، دامنێ مردی، لە بن ئەو بەردە بەجێمبهێلە، تۆ خۆت دەربازکە، من هیچم بەسەر نایێ.

کوڕە:

دایێ، واز لەو قسانە بهێنە، تا بنی دنیا بە کۆڵمەوە بی، ماندوو نابم.

لەو رێیە هەر ژن نا، پیاویشم دی بە کۆڵی پیاوەوە، منداڵیش هەر لێگەڕێ، دوو دوو، سێ سێ بە کۆڵ و ئامێزەوە.

-٣-

ژنێ

برژانگی بە پەلە هەورەوە

مینا چۆلەکەی کەسیرە بوو هەڵدەلەرزێ

پێی لە دوای نایە و

ڕێی کۆچ داناگرێ

دەترسی گۆڕی منداڵەکەی ئاو بدزێ

ئەوە بەردەکەی ئیمامی عەلی، ئەو عەلیەی تا شیر ویستی و دڵ هەڵیگرت، خوێنی نا موسڵمانی نەیاری خۆیانی ڕشت، پاشتریش خۆ و کوڕی بە دەستی موسڵمان هاتنە کوشتنێ، ئەو بەردەی لە ئەفسانەیەکدا، ئیمامی عەلیی شێری خودێ شیری لێ هەڵکێشاوە و کردوویەتیە دوو کەرتی وەک یەک، ئەها ورد لێیبڕوانە، دەڵێی بە شیر کەرتکراوە، لە بن بەردەکە پشووێکی باشمان دا، سەربردەی بەردەکەم بە سێ چوار ڕستەی کورت بۆ هاوڕێکەم گێڕایەوە، گوتی:

چما مام عەلی گەیشتۆتە ئێرەش، تا بەردی بە ناوەوە بکرێ؟

گوتم:

ڕەنگبێ لە خەونێ، یان لە خەونی کەسێکی ئێرە.

عەلی لە خەونێش ئێرەی نەدی، بەڵام سوپاکەیان هی ئەو و عومەر و عوسمان و ئەوانە گەیشتبوونە ئێرە، ئەو سوپایەی وا ئێستا ڕاوی میللەتێ دەنێ، ڕاوی باڵداریش دەنێ، بە زمان و ئۆل وەچەی سوپاکەی ئەوانە، سوپای ئەنفالە.

ماندووین، لە نزیک بەردەکە کز کز دەستەوئەژنۆ

دانیشتووین، ئێستاش چاوم پڕ وێنەی هەینێی ئەو ڕێیەیە، ڕوونترین وێنە وێنەی پۆلێ کۆترە شینکەیە، هاوڕێکەم گوتی:

سەیرکە، باڵداریش ڕێی کۆچی کوردیان گرتووە.

سەرمهەڵبڕی، پۆلێ کۆتر ڕێک بە سەر کۆچدا و بە ڕێی کۆچدا ئاسمان دەبڕن، نەویش زۆر نەوی، وەک بڵێی ترسی فڕۆکەیان لێنیشتبێ، نەوێرن هێندە بەرزببنەوە، بە سەرماندا تێپەڕین، هاوڕێکەم گوتی:

چ دەبوو خودا لە ڕۆژێکی وادا دوو باڵی بۆ مرۆڤ ناردبا؟

گوتم:

گەورەش قەینا، بەڵام خۆزی منداڵ باڵی فڕینی هەبا.

پەڵە خوێنی سەر کراسی سپیی ماتۆڕسوارەکەش لە بینایم نابێتەوە، دیار بوو لە ڕێیێ سێ پەلە ساچمەی وێکەوتبوو، برینەکان سووک بوون، ئەو کوڕە درەنگ لە شار دەرچووبوو، هەواڵی ڕێوبانمان لێپرسی، گوتی:

لەشـکر هەر چـوار دەوری شـاری گرتـووە، ڕێگاکـانی داخستووە، ئەوەی نیازی هەڵاتنی هەبێ، دەبـێ بە دزی و بە نێوان بازگەکاندا مل لە ئاقار بنێ.

پرسیم:

لەشکر لەوێ دایکوتاوە یان بەرە و ئێرە دەکشێ.

گوتی:

تا منیش دەرچووم، هەر لەوێ چەقیبوو، نەجوولابوو.

بەو هەواڵە پشیەکمان هاتەوە بەر.

ئێستا ڕۆژ لە سەر ئاوابوونە، بەری ڕۆژ نەگیرابا، بە چاوی دووربین سێبەری خۆمان لە بەری دەربەنـدی گۆمەسـپانێ بە قەد چیـاوە دەبینـی، چەنـد پەلە هەورێکـی خۆڵەمێشـی پەیدابوون، یان هەر سپیەکان بوون ڕەنگی خۆیـان گۆڕیـوە، ڕەنگبێ دەمێ بێ بە ئاسمانەوە بن، بەڵام من ئێستا دەیـانبینم، نزابکەین نەبـارێ، خـۆ ئەگەر دابکـاتە بـاران، دەبێـتە ڕۆژی پەسڵان، لەو بەرزاییەوە بە دەم پێچانەوە و کێشانی جغارەوە، چاومـان بە سـەر دۆڵەوە، بە ڕێـی کـۆچەوە، ڕێ تەواوێ تەنک بووە، ئەوەی زوو تێپەڕی، ئەوەی پرزەی لێبڕا و تینی

ڕۆیشتنی تێدا نەما و لە ڕێ لایدا و خۆی دا پەنا بەردێ، بنە داری، کەندەلانێ...

لەو ناوە، لە بن بەردەکەی عەلی هەندێ گۆتە و گرتەی کورتم لەبیرە:

عارەبانەیەکی سێ تایە، لە پێشەوە پەتێکی تێخراوە و ژنێک ڕایدەکێشێ، لە دواوە پیاوێ پاڵی دەدات، دیار نیە ناوی چی تێدایە، بەڵام لە سەری دوو قوونکە گونیە و بوخچەیەک و لێفەیەک، دوو منداڵی وردیش لەناو تەشتی شێلم دەڵێی کەڵەبابن هەڵنیشتوون، پشیلەیەکیش لە نێوان هەردوو منداڵەکە بە دوو چاوی تیشکاوی لە کۆچ دەڕوانێ، لە پڕ تایەکیان دەتەقێ، پیاوەکە خۆی شێلوو ناکات، پشتێنەکەی کەرت دەکات، لە جێی تایە لە شێوەی تایە توند لە ڕینگەکەی دەئاڵێنێ و دەکەونەوە ڕێ.

ژنێک کە لە خوار ئێمە دانیشتبوو، لێمان نزیکبۆوە:

کوڕم، ئێوە دەڵێی پێشمەرگەی بە ڕاستین؟

قاسم وا باگۆیدایەوە:

پووری، بە خوا تا سێ چوار ڕۆژی لەمەوپێشێ

پێشمەرگە بووین، بەڵام ئێستا تەڕەماشیش نین.

ژنە هەناسەیەکی وای هەڵکێشا بەردی عەلیی لە بن هێنا:

دایکتان کوێر بێ...

گەڕایەوە لای خێزانەکەی، زۆری نەبرد بە سێ چوار نان و مستێ قەسپەوە هاتەوە، زۆری کرد تا وەرمان گرت، من لە بەشی خۆم کەمێکم لێی خوارد و ئەویدیم خستە کۆڵەپشتەوە، بیرمە هاوڕێکەم گوتی:

پێشمەرگە هەر دەبێ لە سەر زگی خەڵکی بژی.

پیاوێ لەو سەرەوە، روو لە ئێمە پرسی:

ئەرێ مەلا بانگیداوە؟

بە دەمژمێر نا، بە پێی زەردایی رۆژ زانیم، گوتم:

ئا، بانگیداوە.

گوتی:

دڵنیای؟

گوتم:

بەڵێ، بە رۆژووی؟

دیار بوو، کۆچ ڕۆژووەکەی پێنەشکاندبوو، بۆ ڕووگەش لە ئێمەی پرسی، من نوێژ ناکەم، بەڵام لە هەر کوێ بم، ئاسان ڕووگە دەبینمەوە، بۆم دیتەوە و نوێژی دابەست، نەمدی بە چی فتاری کردەوە، لە دڵێ خۆ گوتم:

ئیرەییت پێدەبەم، لەشکری ئەنفال ڕاوتدەنێ و ڕۆژووش ناشکێنی.

لەو پیاوەوە بابمم بیرکەوتەوە، دڵنیام ئەویش نەیشکاندووە و داخوا ئێستا لە کوێ بن؟

خۆزگەم بە دوێنێ ئەو دەمە، کێ هەیە خۆزگە بە دوێنێ نەخوازێ؟ دوێنێ شار لە ماڵی خۆی، لە سەر جێو بالینگانی خۆی، ئەوڕۆش بە دەشت و دەر و گرد و دۆڵ و کێوانەوە، نا، دوێنێ نا، خۆزگە بە سێ چوار ڕۆژ لەوەوپێش بخوازە، پێش کۆچی کوردان لە گەرمیان و کەرکووکەوە، لە دەو زێ و بەری قەرەچووغەوە، داری بریا بەر نادا، لێیگەڕێ.

هەر لە نزیک بەردی کەرتبوو، سەرە ژنێکی سەراپا ڕەشپۆش، لە کەمێ دوورەوە لێت ڕوانیبا، دەتگوت عەبای لە خۆی پێچاوە، هەناوی ئاگری گرتبوو، قوڵپی گریانی

دەیسووتاندی، سێ ڕێز سێ ڕێز فرمێسکی بە سەر کوڵمە سوورەکانی دادەباراند، گوێملێیە دەڵێ:

چاوی دایکت کوێر بێ، نەگەیشتمێ جوان بیپەستمەوە، تەڕ دەبێ...

پێکەوتم دوو سێ ڕۆژێ لەمەوپێش منداڵێکی مردووە و ئەگەر باران ببارێت، گۆڕەکەی ئاو دەدزێ و منداڵەکەی لە ناو گۆڕێ تەڕ دەبێ.

هەر لە بن بەردەکەی ئیمامی عەلی، بالیفێ هەیە، لە بالیفەشەوە بالیفەکەی نەنکم و هی خۆمم بیرکەوتەوە، ژنێێکی بە تەمەندا چوو مستێکی توندی لە سینگی خۆی دا، لەسەرەخۆ هەر ئەوەتا بیستم، گوتی:

دەستی شکاوم، بالیفەکەم لەبیرچوو.

کوڕێک:

دایێ، چەند جارم گۆ، پارە لە ناو بالیف دامەنێ.

دایک:

گوو لە ناو بالیفە، پارەی چی! ئەمن بە بێ بالیفی خۆم خەوم لێناکەوێ.

کوڕ:

ئەگەر خەوت دێ و سەرما لێدەگەڕێ، سەر بخەیتە سەر بەردیش خەو دەتباتەوە.

دایک:

بە خوای کوڕم وا نیە.

نەنکــی منــیش بــالیفێکی هەبــوو، زۆر جــار لە چــوونە ســەرداناں لەگەڵ خــۆی دەیگێــڕا، بــێ بــالیفی خــۆی خەوی لێنەدەکەوت، ئەگەر سەری لە سەر رانی فریشتەش بــا، خەو نەیدەبردەوە، دەیگۆ:

ئەگەر مردم لە ناو گۆڕێ بالیفەکەم لە بن سەرم دانێن.

کوڕەکەی دەیگۆ:

لە بەهەشتێ، بالیفی وات دەدەنێ بە دڵی خــۆت و لەوەی خۆت چێتر.

نەنکم:

بە خودای زەحمەتە لە بەهەشتێ بالیفی وەک ئەوەی مــن هەبێ.

ئەو نەنــکەم لەمێــژ نەبــوو کــۆچێ دوایــی کردبــوو، لە سەرەمەرگێ بە دایکمی گوتبوو:

کچم، خەفەت مەخۆ، خەونم دیتووە کوڕەکەت دێتەوە.

دەمویست سەرێ لە گۆڕەکەی بدەم و بڵێم:

نەنێ، هاتمەوە.

پێڕانەگەیشتم، ئەو کۆچەی بەسەرداهات.

منیش لەگەڵ بالیفی خۆم راهـاتبووم، ئەو کـاتەی بە چیـا کەوتم، خەمـی گەورەم بـالیف گـۆڕین و بـێ بـالیفی بـوو، خۆزگەم بە دوێنێ شەوێ، لە سـەر بـالیفی خـۆم و لە مـاڵی خۆمـــان خەوتبـــووم، دایکـــم دوای ئەو هەمـــوو ســـاڵە، بالیفەکەمی وەک خۆی پاراستبوو، بەرگەکەشی نەگۆڕیبوو.

بەر لە لێژبوونەوە، قەمەرەیێ کە هێندەی سێ قەمەرەی لە خــۆی بــارکردبوو، نــاو بــاولەکەی پێــنج شــەش منــداڵی سەرکەوبنکەی تێدابوو، دەتگـوت بـۆ سـەیران دەچـن، جلکـی نەورۆزیـان لە بەردابـوو، سـترانیان دەچـڕی، لەپـڕ قەمەرە کوژایەوە، ستران بـووە گریـان، لە نـاو سەرنشینان کچێکم ناسـیەوە، تـۆ بڵـێ ژن، ئـاخر سـاوایەکی بە ئـامێزەوە بـوو،

مەمکـی لە زاری نـابوو، دە سـاڵ پتـر بـوو، بـزرم کردبـوو، هەینێ منـداڵکار بـوو، هـاوڕێی منـداڵیم بـوو، ئەویـش منـی ناسیەوە، شەرم دەستی گرت، دەنـا دوور نەبـوو ئـامێزم پێـدا بکـات، پرسـیاری بـابیم لێکـرد، بە وەڵام رانەگەیشـت، ترومبێلەکەیـان کەوتەوە گەڕ و مـاڵاوایی کـرد و رۆیشـتن، ئەو کچە، کچە دارلاستیکهاوێژەکەی حەمەد مەستان بـوو، ئەو پیـاوەی سـەردەمانێ گەڕەکـی مە بەو دەناسـرایەوە و لە(کۆڵان کۆڵان...)یش بە پێکەوە لە سەر سەد سـەرەکۆڵان راوەستاوە.

دنیـا لەگـڕە پێـی بنێـتە تـاریکی، کزەبـایەکی سـارد، کزەیەکی قەندیلی نا، سەفینی هەڵیکـرد، ئـێمەش بە پێـی بـا لێژبووینەوە، ئەوەی ماندوویتیە هەستمان پێنەدەکرد، رێگـاش زۆر تەنک بووە، ئەوەی هەیە پیادەیە، ناوە نـاوە ترومبێلێـک تیژ تێدەپەڕێ، یان ماتۆڕێ کە سێ چوار کەسـی لە سـەرە، سێ چوار سوار پاسکلیشم دی، کەرێکـیش لە بـن تێـرکە و پیرەمێـردێ، بە پێـی کیسـەڵ دەڕوات و بە ئاسـتەم(هەچە هەچە)ی زاری پیرێژنێک و منداڵێک دەبیستم، ترومبێلێکیش لە راسـت ئـێمە تـاوێ راوەسـتا، بـۆنێکی پێـدا پژانـدین، هەسـتمکرد کەوتیـنە بەر کیمیـا، تـومەز ترومبێلـی زبـڵە، پڕیکردبوو لە ژن و منداڵ.

هەر لەو ڕێـیە جـوێنێکی زۆر مـزری پیاوێکیشـم وەک خۆی لەبیرە، دیاربوو بە دەم ڕێوە گوێی بە رادیۆی سەرێوە نابوو، لە هیکەوە تا تینی تێدا بوو، رادیـۆی تێهەڵـدا، لەگینە هەر پـارچەیەکی کەوتبێـتە بـن بەرد و کەسـتەکێ، لەگەڵ تێهەڵدان جـوێنێکی وای بە بێـژەرەکە دا، ڕووی گێـڕانەوەی نـیە، جـوێنەکەی چەنـد جـارێ لە سـەر یەک هەر جـارەی توندتر دەگۆتەوە، دوای لێبوونەوە لە جوێن گوتی:

ئەو دەنگگرە لە درۆیان ناکەوێ.

داخوا ئەمجارە چ شینە درۆیەکی کردبێ، ئـاخر رادیـۆی سـەرێ نەخاسـمە ئەو بێـژەرە هێنـدە درۆی کـردووە، ئەگەر بنووسرێتەوە، کتێبێ پڕدەکاتەوە، ئەز زوو بەر لەوەی هەوای سـەرێ لە سـەرم بـدات و بـبمە هـاوڕێی تفەنـگ و بچـمە سەرێ، دەمزانی ئەو بێـژەرەی رادیـۆی سـەرێ، فرچکـی بە درۆی پارت گرتووە و لە چ درۆیان ناپڕینگێتەوە، دوور نیە هەر ئێستا گوتبێتی:

هەولێر لە بن دەستی پێشمەرگەیە، کەس هەڵنەیێ.

بـۆیێ ئەو پیـاوە رادیـۆکەی خـۆی تێهەڵـدا، درۆی قیرەبڕ کرد.

له هه‌ڵاتن و ئه‌نفاله‌که‌ی هه‌شتاوهه‌شتیش، رادیۆی سه‌رێ
له شینه درۆیان نه‌ده‌پرینگایه‌وه.

-٤-

لەو پێدەشتە

ژنێ ژانی گرت

لایدایە لارێ

زیرەیێ گەیشتە چیا

لەو شەوە تووشە

ساوایێ بۆ کۆچ هاتە دنیا

ئێرە چوارڕیانەکەیە، ئەگەر پشت لە ڕێی خۆمان، ڕێی هاتن راوەستین، دەستی چەپ دەمانباتەوە بەستۆڕە، جێی نەورۆز و هەڵپەڕکێ، ئەو بەستۆڕەی بەر لە بیست رۆژ، لە بەرەبەیانی ئازادیی شار، لە خەیاڵێکی ناسک دار و بەردی بۆ من بووبوونە دەفی پێشوازی، لە (لە ناوزەنگەوە لۆ بابەگوڕگوڕ) گوێت لە دەنگی دەفەکە دەبێ، ئێستاش...

ئەگەر راست و راست بڕۆین، دەچینە ناو دەربەندی گۆمەسپانێ، لەوێشەوە بەرەو سەفینە شێتە، ئەو دەربەندە وەها هەڵکەوتووە، ئەگەر سەد پێشمەرگە لە هەردوو بەر بە قەد چیاوە سەنگەر بگرن، لەشکری ئەنفال بە وەرزێکی شەڕیش بۆی ناگیرێ، بەڵام کوا؟!

دەستی راستیشمان دێگەڵەیە، لەوێشەوە کۆیێ، زۆری کۆچوبار ڕێی دەربەندیان گرتەبەر، ئێمە نازانم بۆ دامانەوە ڕێی دێگەڵە و کۆ، بەر لە گرتنی دەستی راست، لەو چوارڕیانە دیمەنی بۆ هەینێ تاریک بۆ هەوکە ڕووناک هەیە، ڕووێکی پێشاندەدەمەوە:

لێرە لەو چوارڕیانە، سوێندی کەسم لە سەر نیە، لەو تاریکاییە بە دوو چاوی خۆم ڕۆژی دوایيم دی، کەوتمە

ناو رۆژی حەشر، ئەو حەشرەی هەندێ مەلا بە شێوەیێ پێشانیان دەدایەوە، لەو دوورەوە تا و لەرز دەیگرتی و چۆکت دەشکا و دەبوورایەوە، من لێرە لەو کۆچ و هەڵاتنە، ئەو حەشرەم دی، تۆ وەرە لایتێ لێدە، یان لە بەر لایتی ترومبێلێ، ماتۆڕێ لێڕامێنە، ئەو تێکهەڵقژان و کەس بە کەس نیە ببینە، کەس نازانێ چ رێیێ بگرێ، شارێ خەڵک لێرە تێکدەسووڕێ و نازانێ سەری خۆی بۆ کوێ هەڵگرێ، تۆ گوێ لە هاتوهاوار و قیژەی ژن و زیڕەی منداڵ بگرە، هەینێ دەزانی لە سەر دنیاش لە سۆنگەی ئەنفالی عارەبەوە، شەوێ هەیە، شەوی حەشرە، حەشرە، لە سەر دنیا حەشرە، تێکهەڵقژان و سەرلێشێوان و تێکسووڕان و بزربوونێکە، کەس نەک هەر کەس خۆشی نابینێتەوە، شەوی وا نەبووە و نیە و نابێتەوە، پەسڵانی ئێرە لە پەسڵان پەسڵانترە و چ خوداوەندێ ئاگای لێنیە، من توند گوێی خۆم نەگرتبا، بەرگەم نەدەگرت و وەکوو شێتەکەی رێ شێت دەبووم و بە گژ ئاسماندا دەچووم، یان دەبوو وەک ئەو ژنەی تەنیشتم بکەم.

ژنێک وا تێبگەم منداڵی گچکەی لێ بە جێماوە، بە هەردوو دەستان سینەی خۆی دەکوتێ و دوو دەستیدی

قەرد دەکات بۆ پرچ رنینەوە و بە سێ دەنگان گازدەکات:

کوڕە جەلال، کوڕە مەسعوود، ئەنگۆ ئەو میللەتەتان لۆ بەو دەردە برد، دەک بەر گوللەی جامبێزار کەون، بەرە، بەرەی دز و جەردە، ئەنگۆ لە کێن، لۆ دوو تەقەتان نەکرد، لۆ؟ کلکتان لە گەلۆزتان نا و قووچاندتان و...

ژنە هەرچی بە زاریدا هات، تا دەنگی نووسا، بە سەرکردە و بنکردەی دا، هاوڕێکەم گوتی:

ئێمە نەبینێ باشە، ئەگینا داخی مەلایی و جەلالیش بە ئێمە دەڕێژێ، خۆ تۆش جەمەدانیەکەت سۆرە، رەنگبێ وا تێبگات...

جەمەدانیەکەم دواتر لە گوندێکی بن شنۆیێ کێشەیەکم بۆ دەنێتەوە، جارێ لێی گەڕێ، رەنگە سەربردەی جەمەدانی بکەوێتە کتێبێکیدی و لەوێوە بیبیستین.

پیاوێک لە چەقی رێ، لە شێوەی تارمایی دیارە، بە دەنگێکی گەورە هاتەگۆ، لێرە کورتەی گۆتەکانی دەنووسمەوە:

خەڵکینە، راوەستن، چیدی مەڕۆن، لەو کێو و شاخە لە

سەرما رەقدەبنەوە، لە برسا سەردەنێنەوە، بە قسەی من دەکەن، هەموو پێکەوە دەگەڕێینەوە، باوەڕناکەم حوکمەت میللەتێک بە سەر یەکەوە کوشتوبڕ بکات، قرچوبڕ بکات.

ئەو دەنگە رەنگە هەر ئەو پیاوە بووبێت کاتێ کۆپتەرەکان ئاسمانیان لێگرتین گوتی:

بۆ بۆردومان نا، بۆگەڕانەوەی ئێمە هاتوون.

دەنگێک لە تەنیشتمەوە:

ئەوقسەیە رێی تێدەچێ.

دەنگێکیدی:

دوورنیە وابێ، بەڵام دڵی من وا ناڵێ.

هەندێکیش جڕتیان بۆی کیشا، گوێم لێیە کەسێ دەڵێ:

ئەو پیاوە هەبێ نەبێ بەعسیە، چینە لێدانێکی گەرەکە.

لەو ساتە لە ناو ترومبێلێکەوە:

هەرێن هات، موجاهید هات.

ئێمەش رێی هەڵاتنمان گرتە بەر، ئێوە دەزانن

موجاهیدەکان چەتەکانی مریەم و مەسعوود رەجەوی بـوون، ئەوانە لە کـنە خـۆی دژی خـومەینی چەکیـان هەڵگرتبـوو، بەڵام بـۆ سـەدام شـەڕیان دەکـرد، لەو راونـانەی کـوردیش بوونە بەشە دڕندەکەی لەشکری ئەنفال، دوێنێ پێـرێ لە نـاو شـــار نـــاوی ئەوانە زۆر دەهـــات، لە لای گەرمیـــان و کەرکووکەوە، بە دەبابەی ئەنفالەوە کەوتبـوونە دوای کـورد و دەســتیان لە ژن و منــداڵیش نەپاراســتبوو، بـۆیە هەمــوو زراویان لەو چەتە ئەنفالچیانە چووبوو.

ئیدی دەستی راستمان گـرت و باڵمـان گـرت، لەو رێـیە رەنـــگە بە هـــۆی تـــاریکیەوە بووبێـــت، کەســـمان نەدی پەکیکەوتبێـــت و پێویســـتی بە دســـتگرۆیی هەبـــێ، ژن و منـداڵیش کەم بـوون، پتـر سـەڵتە زەلام، چەنـد تـرومبێلێکم دیـت لە راسـتی ژن و منـداڵ رایانـدەگرت، هەنـدێ پیـاو دادەبەزیـن و لە جێـی ئەوان ژن و منـداڵ سـوار دەبـوون، پیاوەکان وەک ئێمە دەبوونە پیادە، وای ئەو بە هاناوە هاتنەم بە دڵ بـوو، پێشـترێ هـی لەو شـێوەم نە خوێنـدبۆوە، نە لە فیلمـــان دیتبـــووم، لە خۆشـــیا گریـــانم دەهـــات، کـــۆچم لەبیردەچۆوە.

بەر لەوەی شەوبای خەیاڵ هەڵمگرێت و بمبات، وێنەیـێ

هەیە، هەوکەش لەگەڵ زیڕەی هەر ساوایێ ئەو وێنە تاریکە بە روونی خۆی نیشانمدەداتەوە:

شەو بە هەڵەی نەبردبم، لە ئاقاری گوندی ئەشکەوسەقا بوو، ترومبێلێ لە دەو جادە رایگرتبوو، چەند کەسێ تێکدەسووڕان، گوێمان لێبوو ژنێک بە گریانەوە دەیگوت:

خودایە، هەوکە کەینێ کاتی ئەوەیە.

ژنێک دەڵێ:

خودا چ بکات، کە مانگ و رۆژی خۆی هات...

ژنێك دەڵێ:

پێدەچێ کاتیشی نەبێ، تەنها...

پیاوێک:

بیبڕنەوە، کاتی پرتەوبۆڵە نیە.

ئێمە کاتێ زانیمان کێشە ژنە و ژانی منداڵبوونە و هیچمان لە دەست نایە رۆیشتین، هێندە دوور نەکەوتبووینەوە، شەوبا گریەی ساوایەکی بە گوێماندا دا، لەو شەوە کۆچە منداڵێ لەو گۆڕە، لە ناو گیاوگۆڵ بۆ

کۆچ و هەڵاتن هاتە دنیایێ، ئیدی نەمزانی، داخوا ژیا، یان سەرماوسۆڵە کوشتی، یان...

بیرمە هاوڕێکەم گوتی:

تۆوی کورد هەرگیز نابڕێتەوە، لە ناو زیندان و لە کۆچ و بەر ئەنفالیش منداڵ دەنێتەوە.

لەو رێیە کزەبایێ هەڵیکردووە، بۆنی باران بۆنی گیاوگۆڵ و گوڵ و گەڵا و پەلکی داران دەپژێنێ، بایێ ماندوویێتی و خەفەت دەپەڕێنێ و لەبیرت دەباتەوە تۆ لە کۆچ و هەڵاتنی، من ناوە ناوە خۆم دەدایە دەست شەوبا و بە دەم رێوە لە کۆچ دادەبڕام و خەیاڵ دوور دوور دەیبردم، هێند دوور بە خەیاڵیش نەدەگەڕامەوە ناو کۆچباری نەتەوە، خۆشم نازانم چۆن ئەو ڕێیەم بڕی و گەیشتینە سەر سێڕیانەکەی بن دێگەڵە، لەو رێیە پڕ خەیاڵە، تەنها دوو سێ وێنەم لە یادگەم پاراستووە:

لە راست ئەو چەمەی لە زنجیرەی چیای چێشکێوە، دێتەوە سەر رێ و زستانان و بەهاران نازانم لە کوێوە لە بەستی شەرغە دەکاتەوە، بەو شەوە دۆڵ و چەمەکەم ناسیەوە، لەوێ گرتنی خۆم بیرکەوتەوە، ئەها ئەوەی لە(لە

گوڵەستێرەکان کوژانەوە) گێڕاومەتەوە، ئەویٚ ساڵیٚ لە ڕۆژی بە چیا کەوتنم، کەوتمە دەستەییٚ جاشەوە، لە بەر خۆمەوە گوتم:

ئەو جاشانەی منیان گرت، ئەگەر تەمەنی درێژیان بۆ سەرۆکەکەیان بەجێنەهێشتبیٚ، ئێستا یان لە شانی لەشکری ئەنفالن و ڕاومان دەنێن، یان بەگەڵ کۆچ کەوتوون و ئەنفال ڕاویان دەنیٚ.

قاسم، وادیارە گوێی لەو مشتومڕە بووە کە خۆم دەگەل خۆمم دەکرد، گوتی:

جاش هەر جاشە، ببێتە خدری زندەش، جاشایەتی خۆی دەکات و جۆی گەوادی دەخوات.

لە بن لایتی کزی ترومبێلێکەوە، لە ناو تێرکەی سەر پشتی بەرزەیەکەوە، یەک دوو شت ملەقوتێیان دەکرد، زۆر لە پشیلە دەچوون، لێیان نزیک بوومەوە، چوار منداڵ، دوو لەو تا، دوو لەم تا، پیاوێک جلەو بە دەستەوە و ژنێک و کوڕیژگەیەک بە دوای بەرزەوە.

دوو سەگەکەشم لەبیرە، یەکیان هێند سپی بوو، شەویش

نەیتوانیبوو سپێتیەکەی بشارێتەوە، ئەو دوو سەگە لەوێوە لە چواررریانەکەوە بەم ڕێیەی کۆچدا بە پێی ئێمە بێ حەپە لە ترسی لەشکری ئەنفال دەو ڕێ و دەو ڕێ، ڕێی بەرەو پەنهانیان گرتۆتە بەرێ.

لرمەی تۆپ و بریسکەی ئاگریش لە ئاسمانی بەری شارەوە گاف نا گافێ لە خەیاڵی فڕینیان دەکردم، دەیانهێنامەوە و سەر ڕێی کۆچوبار.

بەر لە گەیشتنە سێڕیانەکە گۆتمە هاوڕێکەم:

نزا بکە، لەشکر ڕێی نەگرتبێ، ناچار نەبین بەو چیایە سەختەدا هەڵگەڕێین.

گوتی:

هاوڕێ، لەشکر بە کوێدا دەگاتە ئێرە؟ مەگەر کۆپتەر دایبەزاندبێ.

وا دیاربوو، شارەزای ئەو ئاقار و ڕێوبانە نەبوو.

-٥-

له ڕێی کۆچا

درەختێکی کەسک کەسک هەبوو

له لک مەکه، له پەلک مەدینه

ئەنفال گەیشت و کردیه ڕەژوو

ئۆخەیش، لەشکر دووڕیانی پێشمانی نەگرتووە، کۆچ ڕێ و ڕێ، ڕاستەڕێ ڕێی گرتووە، من ترسم لە ڕێی ڕاست بوو، ئەو ڕێیە ڕێی سەربازیە، دوای ئاشبەتاڵەکەی شازدە ساڵ لەمەوپێش، لەشکری ئەنفال کردیەوە، ئەو ئاشبەتاڵەی لە چاو ئەو شاربەتاڵەی ئێستا چوونە سەیران بوو، ئەو ڕێیە لێرەوە شۆڕدەبێتەوە، بەستی شەرغە دەبڕێ و هەوراز دەبێتەوە، لە شێوەی مار پێچاوپێچ دەکشێ و لە قوشتەپە لە جادەی هەولێر_ کەرکووک دەکاتەوە، ئەو قوشتەپەیەی شەوی چووی نا ئەویدی لە بن دەستی خۆمان بوو، لەوێ سەنگەرمان گرت و پێمان چەقاند و بۆ تاوێ بەرسینگی سوپای ئەنفالمان گرت، بەو نیازەی نەهێلین پێ بخاتە شار، شاری قەڵات و منارە، بەڵام سەرانی بەرە پشتیان تێکردین، پشتیوانیان بۆ نەناردین، ئەوەبوو لەشکر گەیشت و کۆچوباری گەیاندە ئێرە.

وا چاکە هێندە لەگەڵ چووان نەچم، نەبادا خەم و کول لە پێم بدات و لە ڕۆیشتن بکەوم و لە کۆچ بەجێبمێنم و ببمە بەڵا بۆ هاوڕێکەم.

لە بەرزاییەکە لێژبووینەوە، سەگە سپیش لەگەڵ هاوڕێکەی وا لە پێشمانەوە، لە چەمەکە مەتارەمان پڕکردەوە.

دەمژمێرەکەم دەم ناخوێنێتەوە، نازانم چ کاتی شەوە، پێدەچێ دەمەوبەیان بێ، کۆچوباری نەتەوە پانە و پان رووە و رۆژهەڵات هەڵدەکشێ، کۆچوبارێ نە بەرایی دیارە نە بنی.

+ئێرە کوێیە؟

-دێگەڵە.

+زۆری ماوە بۆ کوێین؟

-لەگینە لە نیوەی رێ بین.

لەگەڵ هاورێکەم لە بەرزاییەکەی ئەو بەری پردەکە لە دەو رێی کۆچوبار بە دیار دێگەڵەی تاریکەوە بینێکمان دا، ئەو دێگەڵەیەی سێ چوار ساڵێ پاش ئەو شەوی کۆچە، دوو پارتە زلەکەی بەرە، دوو پارتی بە هزر هۆزگەری و بە رەوتار چەتەگەری، جەلال و مەلایی کردیانە تخووبی نێوان دوو میرنشین، تخووبێ تەلبەندتر و موکمتر لە دیواری بەرلین.

لەوێ دانیشتین و ئەو کەرتە نانەمان خوارد کە بۆ برسێتیەکی وا هەڵمانگرتبوو، نانی ژنەکەی کن بەردە کەرتبووەکە.

شـەو چـوو، ڕۆژ هەڵاتـووە، کـۆچ تەنـک بـووە، بەڵام ناپسێتەوە، ڕێ و ڕێ کۆچ بە چەپی زنجیرەی باواجی ڕێـی گرتووە، تا ئێرە هەردوو سەگەکەمان لەگەڵ بوو، وا تێـبگەم ماندوو بوون، لەگەڵ من و هاوڕێکەم دەرنەچوون، ئەو ڕێـیە دوور و درێـــــژە دەتپســــێنێ و نـــــابڕێتەوە، هەزار وردە سەربوردەی ئەو ڕێیە، هی ئەو کـۆچەم لە سـەرە، بەڵام بـۆم گردناکرێتەوە، خۆ بە دەستەوەنادەن و نـایەنە نـاو گێـڕانەوە، هەرچۆنێ بێ، بە زۆر لە خـۆ کـردنیش بـێ، بە نیـوەچڵی و سێ چوار دێریش بێ، سێ چوارێکیان دەگێڕمەوە:

بەو سـپێدەیە لە بەری بنـارەوە دەنگـی شمشـاڵ هـات، دڵنیشنتر و ڕۆندکاویتر لە شمشالەکەی قـالە مەڕە، دەتگـوت مینکەی شمشـاڵژەنە زینـدووبۆتەوە و بـێ پسـانەوە ژانـی ئەو کۆچە نەپساوەیە دەژەنێ، بۆ ناسینی ئەو مینکەیەش ناچـارین بگەڕێینەوە(کۆلان کۆلان...)، جارێ لێـیگەڕێ، کاتمـان نـیە بۆ گەڕانەوە.

شمشاڵ لەو بنارەوە بە سەر کۆچـدا دەگریـێ، هەسـتدەکەم لە کونەکانیەوە ڕۆنـدک تنـۆک تنـۆک دادەکـات، منیشـی گریاند، من گرینۆکم، لە هەر بارێک بم، گوێم لە گریـانی ژن و شمشاڵی ڕۆندکاوی بێ، ڕۆندکم سـێ ڕێـز سـێ ڕێـز

دێتە خـوارێ و راناوەسـتێ، گریـام، بە دەم رێـوە دوور لە چاوان تێر و پڕ گریام.

لەو شمشاڵەوە شمشاڵەکەی خـۆم بیـرکەوتەوە، شمشـاڵەکەی من شمشاڵی منداڵی بوو، بەری چەنـد سـاڵان کـاتێ بە چیـا کەوتم، دەمویست لەگەڵ خۆمی ببەم، بیرمناکەویتەوە بۆچی نەمبــرد، زۆرم خۆشدەویســـت، بەو شمشــاڵە بە قەد شــوانێ شمشاڵم ژەنیوە و زۆریشی بۆ ئەو کچە بوو کە سـەر بە هەر سـەرە کـۆڵانێکی کـۆڵان کۆڵانـدا دابگـری دەیبیـنەوە، ئەو کچەی لایەکی دڵمی برد و نەیدامەوە.

ئەوێ رۆژێ کــاتێ دایکـــم بــالیفێکی هێنــا و زارکـــی بەرگەکەی کـردەوە، شمشـاڵ هـاتە دەرێ، پێـی شاگەشـکە بـووم، تـۆ بیـریلێبکەوە، دایکـم ئەو هەمـوو سـاڵە شمشـاڵ و بالیفەکەمی پاراستبوو، بەڵام ئەو جارە کـێ بیپـارێزێ، دەی، ڤیروسیا لە شمشاڵ هەر ئەوان هیچیان بە سـەر نەیە، شمشـاڵ چ نیە.

بە رێـی کۆچـدا رێـدەکەین، نە رێ دەبـڕێتەوە، نە گریـانی شمشاڵیش دەبڕێتەوە.

لە دۆڵاییەکەی ئەو دیو لە دەو رێ تڕومبێلێ راوەسـتاوە،

جبەخانەیێ کلاشینکۆفی لێ بارکراوە، هەموو لوولە رووەو ئاسمان، دوو کەس لە ناو تفەنگان دانیشتوون و جغارە بە با دەکەن، شوفێرەکەم ناسیەوە، ئەو جاشە بوو کە دوای ئازادیی شار خۆی کردبووە پێشمەرگە، دوێنێش لە جادەی سێتاقان لە دەمی کۆچی شار بازگەی دانابوو، دەیگۆ:

هەر کەسێ شار بەجێبهێلێ، دەبێ چەکەکی لێرە دانێ، ئێمە بەرگری دەکەین.

ئەوە بوو لەوێ چاومان لێسوورکردەوە و بازگە بەتالی کرد، ئێستاش ئەوەتا پێش هەمووان گەیشتۆتە ئێرە، نەگەیشبووینە تەنیشتی، گڕەی لە ترومبێلەوە نا، بە رێی کۆچدا بالی گرت.

گۆتمە هاورێکەم:

دەزانی ئەو پیکابە تفەنگە کێ بوو؟

گوتی:

نازانم، بەلام دلنیام جاشە.

گوتم:

راسته، ئەو کەسە بوو کە لە شار بازگەکەمان پێهەڵگرت.

بە گاڵتەوە گوتی:

دە لێگەڕێ دوو فیشەکی بە قوونەوە نێم.

گوتم:

واز بێنە، با لەو رۆژە بە دەستی جاشە پێشمەرگە تیانەچین.

بە پیکابێ چەکەوە قووچاندیان و ئێمەش پێ بە پێی کۆچ، بە پیادە رێمان بڕی.

لە راست ئەو باریکە رێیەی لە دەستی راست لە جادە دەبێتەوە، ئەگەر بیگری چەند رێچکەیەکی لێدەبێتەوە، یەک لەوانە دەتباتەوە کانی دەربەند، ئەو دێیەی بەر لە تەمەنی سۆفیەکی پشت کۆمی لە دەربەندەکەی خۆی ناشت و درەختێکی بەژن شەنگ لە خوار گۆڕەکەی روا، تا ئاوی ویست بە کانیەکە ئاوی دا، درەختەکە تا سێ چوار ساڵێ لەمەوپێش هەر بە پێوە بوو، دەمەو عەسران سێبەری هەندێ لقی دەگەیشتەوە سەر کێلی سۆفیەکە، ئەوە بوو ئەنفال گەیشت و کانی چککرد، درەختی سووتاند، کێلی شکاند،

سەربردەکە ناسکە، سۆفیەکە زوو دەست لە دنیا هەڵدەگرێ، بە کەرێکی لە بەفر سپیترەوە سەری خۆی هەڵدەگرێ، ئاقار ئاقــار، دێ دێ دەگەڕێ، هەر خــۆی دەزانــێ بە دوای چ راستیەکی بزربوودا سەرگردان و سەوداسەرە، دوای تەمەنــێ گەڕان ئێرە دەبێـتە دوا مـاڵی و لە گەڕان بە دوای بزربـوودا دەگەڕێ، ئەو سۆفیە ناوی کەریم بوو، بابی باپیری من بوو، باپیرە منی بە ناوی بابیەوە نـاودێرکردووە، تـا بچـمەوە سـەر ئەو و رێی وی بگرم، سەرم بچێ نوێژم نەچێ و ...

ئەرێ، سەر باسی من چی بوو، ئەو سۆفیە لە کوێ پەیدا بوو، منی بە لاڕێی گێڕانەوەدا برد؟

ئا، لە راستی ئەو باریکە رێـیە پیاوێـک جلکـی مەلایـانی لەبەر نەبـوو، بەڵام بە چەفـیەی سـپی و ردێـن و سـمێڵ و گـۆتەی بە مەلا دەچـوو، لە دەو جـادە هەشـت نـۆدە کەس لێی خڕبوونەوە، لەگژ بوون نوێژ دابەسـتن، مـن لەو کـاتە لە نزیک ئەوان راوەستابووم و رووم لە ئاقـاری کـانی دەربەنـد بوو، رەنگبـێ بیـرم لە کـانی و درەخـت و کێلـی سـۆفیەکە کردبێتەوە، مەلا لە خەیاڵی کردم و گوتی:

ئێوەش وەرن، با پێکەوە لە خودا بپـاڕێینەوە، بەڵکـوو ئەو

زۆردارەی بەغــدا پەژیــوان بکــاتەوە و لەشــکرمان لە دوا بکاتەوە.

بە رەقیەوە گوتم:

من نویژ ناکەم.

مەلا بە بزەیەکی ناسک و زمانێکی شیرینەوە:

خوا کارت راست بێنێ.

لەو شــــێوازە نەرمەی مەلاوە لە شــــێوازی خــــۆم پەژیوانبوومەوە، بەڵام پێملێنەنا و بە سەر خۆم نەهێنا، ئەوەشم لە بیرە باپیرمم بیرکەوتەوە و گوتم:

بــاپیرە، چ فەرمەســۆنێکت بە نــاوی ســۆفی کەریمــی باوکتەوە کردووە!

دوای لە نوێژبوونەوە قۆناخێک لەگەڵ مەلا و دەستەکەی لەگەڵی بوو، شان بە شانی ئێلك بە رێی کۆچدا رێمان کرد.

لە راست ئەو گەلی و رێیەی لێرەوە دەچێتەوە ئەها ئەو کەلەی دەڵێی ناو گەڵی بەرزەیەکە لە ساتی گەوزین، ئەو کەل و گەلیەی بەر لە ئەنفالی ئەوێ ساڵێ، رێی پەڕینەوە،

رێی ئاودیوبوونی پێشمەرگە بوو، من شەوێک لێیەوە ئاودیو بووم، لە(گوڵەستێرەکان...) لە بن ئەستێرەی کز ئەو گەلی و کەلەم پێشانداوەتەوە.

ئـێ، لە راســت ئەو گەلـیە پیاوێـک بە سـەر پشـتی کەرێکەوە، کەرێکی سپی سپی، بە دووری مەبینە لە تیرەی کەرەکەی سۆفی کەریم بێ، لە جادە دەپەرێتەوە، لە بەری هەڵەت و زوورگ و باسـکەکانی بەسـتی شـەرغەوە دێ، رێک و رێک رووەو چیا رێ دەبڕێ، لە قسەکانیڕا دیارە، لەو چەنـد رۆژەی ئـازادی سـەردانی گونـدەکی خـۆی کردۆتەوە، ئەو گوندەی خشتێکی بە پێوە نەماوە، ئەویش لە گەڵ گوندان بەر لە چوار ساڵ لەشکری ئەنفال تەختی کرد و لە گەڵ زەوی کـردیە یەک، پیـاوی سـەر پشـتێ کەرێ گۆچانەکەی لە ئاسمان رادەشەقێنێ، با وێکـڕا گوێبـدەینێ، داخوا چ بێژێ:

هێی، لە گەڵ تـۆمە تـۆ، لە ئاسـمانێ چ کـارەی، توخـدا خـودایەتی ئەوهـایە؟ حوکمەتـت لە مە بەردایە، شـەرم داتنـاگرێ ئەو مـیللەتەت بەو چیـاوچۆلە خسـتووە، پێڕانەگەیشتم سەردانی گۆڕی کەسوکاریشم بکەم، عارەبت بە سـەر وەرکـردینەوە، ئەتـۆ چ دڵێکـت هەیە، چ کێشـەت

لەگەڵ مە هەیە، تۆڵەی کێمان لێدەکەیتەوە؟ خـودا دەیزانـێ لە جێـی تـۆ بـام، دەهـاتمە خـوارێ و لە بەر چـاوی مـن و کەرەکەم، پاکەتێ فیشەکم لە سەر دڵی خۆم بەتـاڵ دەکـرد و...

هەنـدێ لەو کەسـانەی گوێیـان لێبـوو، کەوتـنە قسـە و پرتەوبۆڵە:

-بە خودای ئەوەش تێکچوو، بە کێو کەوت.

-کێ بێ شێت نەبێ، ئەوە نیە هەمووومان بە دەشت و کێو کەوتووین.

-خوا لێی گۆڕیوە، خودایە، لێمان نەگۆڕی.

-خودایە، تۆبە هەزار تۆبە بە خراپەی ئەو شێتەمان لەگەڵ مەکە، هەر خۆت دەزانی چ دەکەیت، ئێمەی بەندەی قوون بە گوو، چ لە گەورەیی و کردەی تۆ تێدەگەین.

-ئەو پیاوە تێکنەچووە، قسـەی دڵـی مـن دەکـات، خـودا ئەگەر لە ڕۆژێکی وا بە هاناوە نەیەت...

-هەر کەسێ گـوێ لەو پیـاوە ڕاگـرێ، دەبێـتە هاوبەشـی گوناحەکانی.

کابرا بە گازاندەکردن لە خودا و گۆچان راشەقاندن لە ئاسمان، رێی خۆی گرت و بە دۆڵەکەدا سەرەو چیا هەڵکشا.

بەر لە گەیشتن بە بەردە دواتر نەخشاوەکان، ترومبێلێ کە هێندە پڕ نەبوو، لە ئاست ئێمە رایگرت، گوتی:

وەرن سواربن.

قاسم گوتی:

لە ئێمە گەڕێ، تا ژنێ، منداڵێ پیادەبن، ئێمە بە پێ دەڕۆین و سوار نابین.

کابرا سەری بادا و پێی لێنا.

هاوڕێکەم بیرمنیە لە کێ و چۆن دوو سێ نانێکی دەستکەوت، لە ئاقاری پیرەرە، کوێیە، لامانداية ناو بەردەکانی دەستی راستی جادە و بە گیاو گوڵی بەهاریەوە بزن ئاسا لوولماندا، لە بن بەردێ لەو بەردانە لە سەر تێری لەگەڵ هەر مژێکی جگەرە، وینەی دووکەڵەکەی بۆ چایەک بە ئاسماندا دەچووم.

ئەو بەردانە پاش پێنج شەش ساڵێ، وێنەکێشێ نەخشاندنی، کردنیە کۆتری سپی، کردنیە تابلۆ بۆ بە هۆشداهاتنەوە و ئاشتبوونەوەی دوو هێزی شەڕ، دوو بەرەی شەڕ، بەرەی بارزانی و تاڵەبانی، ئەو دوو بەرەیەی دەتگوت زادەی سەدامن، تا توانیان خوێنیان رشت، هەرچی خێر و بێری ئەو وڵاتە هەبوو لرفیان کرد، سەر زەوی و بن زەویان دزی، بەردە نەخشاوەکان لە رەنگ چوونەوە، هێزەکان هۆشیان نەهاتەوە بەر، لە چەتەیی نەکەوتن.

بەینێکی باش لە ناو تاشەبەردان ماینەوە، خەڵکێکی زۆر لایانـدابووە ئێرە، هەبوو پرخەی خەوی دەهات، رەنگبێ ئێمەش سەرخەوێکیشمان شکاندبێ.

هەستاینەوە و بەگەڵ کاروان کەوتینەوە.

وا تێبگەم لەو رێیەوە هاتن کە لە دەستی راستەوە لە جادەی دەکردەوە، هاتن بەگەڵ کۆچوبار کەوتن، ئەو رێیەی ئەگەر بیگریت و دوایی بە دەستی چەپدا بادەیتەوە راست و راست دەتباتەوە مەکە و مەدینە، پیرێ رێک لە کەمەی قوتە گۆچانکەی دەستی دەچوو، کەرێک و دوو سێ بزنی بە پێش خۆی دابوو، کەرەکە بار و ژنێکی بە

سـەر پشـتەوە، پیـاوەی پشـت لەکەمەی گۆچـان چـوو، ئەو ڕێوبانەی پڕکردبوو لە(هەچە هەچە و ییخە ییخە)، دیار بـوو بزنەکان ڕێیان دانەدەگرت، کەسێ پێیگوت:

خارە، واز لە بزنەکان بێنە، خۆتان دەربازکەن.

ئەو مەکە و مەدینە ئەوە نیە کە ئەنفـالی لێـدابەزی، مەکە و مەدینەی ئەو ئاقارەی وڵاتی کۆیێ، ناوی بـنە دارێ بـوو، کەوتبووە سەر بستیایێ، دارێ بوو لە قسـان پیرۆزیـی لەوەی عارەبستانێ وەرگرتبوو، دایکم دەیگۆ:

حەفت دەردت هەبێ، لنگت لە دوو نێ، عیزرائیـل دەور و سوڕت بدات و لە سەرت بگەڕێ، بگەیتە سێبەری داری مەکە و مەدینە، بەڵات لێدەبڕێ.

بیرمدی لە دایکم پرسی:

یان مەکە یان مەدینە، لەبەرچی هەردووک پێکەوە؟

گوتی:

ئەنکت دەڵـێ لقەکـانی هـی مەکە بـوون، پەلکیشـی هـی مەدینە.

بە گۆتەی گۆتیاری تەمەنی ئەو دارە بیست و شتێ پشت پتر بوو.

مەکە و مەدینەی ئێمە بە دەردی وڵات چوو، لەشکری ئەنفال گەیشتێ و ئاگری دا، نازانم شینبۆوە یاخود نا.

ئێ، پیرە راوەستا و روو لە کابرا، هەموو هێزی دا خۆی تا تۆزی پشتی قیت بکاتەوە، بەڵام تەنها سەری بەرزبۆوە، لەو ساتە چەند لە کەڵەبابێ دەچوو کە لە باری بانگدان بێ، بە تووڕەییەوە:

بزنەکانم لە خۆم خۆشتر دەوێن، لۆ لەشکریان بەجێناهێلم.

ژنەش لە سەر بارەکەوە ئاوڕی دایەوە، شتێکی گۆ تێنەگەیشتم.

کەوتینەوە رێ، لێرەش گوێبیستی(هەرێ هات، موجاهید هات) دەبین، بەڵام ئێمە لە سەرخۆ دەڕۆین و خۆ تێکنادەین، خۆ ئەگەر لەشکر بشگات، چیا نزیکە و پەنای بۆ دەبەین، فرۆکەش هەستێ، چ زۆرە بەرد و بنەدار و پەنا زۆرە، پەنامان دەدەن، من هۆبڕاو نەبووم و هێشتا چاوەڕێم پێشمەرگە بگەن و سەنگەر بگرین، بەرەنگارببینەوە و لەشکری ئەنفال لە شوێنێک رابگرین، بۆیێ پەلەمان نەدەکرد و ناوە ناوە دادەنیشتین و بە دەم جگارەکێشانەوە

چاوەڕێمان دەکرد، هاوڕێکەم جغارەکێش نەبوو، زوو زوو دەیگۆ:

هێندە بکێشی، دەکەوی.

دەمگۆ:

کەنگێ جغارەم لێبڕێ، هەینێ دەکەوم.

لە دەو ڕێ بە بەری زنجیرەی باواجیەوە، لە پەنای دوو سێ گابەردەوە بۆنی ناوسێری هات، وای لەو بۆنە دلکێشە، چەند خۆشە ئێستا چوار پێنج ناوسێری بە چایە و ماستی بزنەوە لوول بدەی، لە چایە و ماستەکەش گەڕێ، ناوسێری و بەس، وەک بلێی هەستیان بە برسێتی و حەز و نەوسی ئێمە کردبێ، لەو دیو بەردەکانەوە، سەرێ بە ڕەفتەوە دەرکەوت:

کوڕم، وەرن کەرتە ناوسێریەک بخۆن.

گوتم:

سوپاس برسیمان نیە.

گوتی:

بۆ ڕێی هەڵگرن.

ژنە سەر و دوو ناوسێری داینێ.

هاوڕێکەم گوتی:

هەر ناوساجیەک بە حەجێک هەیە.

پیاوەکە هاتە ناو قسانەوە:

دە ڕاوەستن، با منیش چوار حەج بکەم.

بەجێمان هێشتن و نەمانزانی دوای ئێمە چەند جاریدی چوونە حەجێ!

شەو داهات و ڕۆژ هەڵاتەوە ئێمە هەر لە ڕێین.

کۆیێ هێندەی نەماوە، ئێرە وا تێبگەم ئاقاری تۆپزاوەیە، هەوراز و نشێوە، گەیشتینە ناو هەندێ بنەدار و کەڤر و تیشەبەرد، چەند دەستەیی چەکدار بە دیار ترومبێلەوە ڕاوەستابوون، بە پێشمەرگە دەچوون، دڵم خۆش بوو، لە دڵی خۆم گوتم، دیارە لێرە بەرەی شەڕ دەکەنەوە و هەڵاتن نامێنێ، دەمانویست قسەیان لەگەڵ بکەین، بە پڕتاو سوار بوون و...

ئێرە ئەو جێیەیە کە پاش چوار ساڵێ لەو کۆچە کورە ئازاکەی ئایشەگوڵ بە خۆ و یازدە دوازدە هاوڕێوە، بە دەستی دەستەیێ لە بەرەی شەڕ هێند نامەردانە شەهید دەکرێن، مەگەر تەنها لەشکری ئەنفال نامەردیی وای لێبوەشێتەوە، نامەردیەکی وا پشتئاشانیکیدیان تۆمار کرد، ئەو پشتئاشانەی شاعیرێک بە کوشتارگەی سەبرا و شاتیلای لای فەلەستینی دەچوێنێ.

کۆچ ناپسێتەوە و بە ڕێوەیە، ئێرە بەرایی ئەو درەختانەیە دەڵێی بۆ پێشوازی رێبواران لە هەردوو بەری جادە قیت راوەستاون، درەختەکانی نازانم کێ بەهار، ئێرە کۆیێ.

-٦-

بۆ ڕەقیب دەمێنینەوە

لە هەڵاتنێش

ئەی ڕەقیب دەڵێینەوە

بەر لەوەی درەختەکانی پێشوازی دەربکەون، گوتمە هاوڕێکەم:

خزمم زۆرن لە کۆیێ، خەمی جێوڕێمان نیە.

گوتی:

ئەگەر کۆیەش بارگە و بنە تێکنەنێ و بەگەڵ کۆچ نەکەوێ.

گوتم:

هەر ئەوە مابوو، ئێرە سەختە ئاسان ناگیرێ.

گەیشتینە ئەو شوێنەی رێیەکی لێدەبێتەوە و دەچێتەوە ئاقاری گۆڕقەرەجێ، زێدی حاجی، ئەو حاجیەی بەژنی بڵندترە لە باواجی، لەوێ لە دوور لە بەری زێی گچکەوە لرمە لرمی تۆپان دەهات، ترسم لێ نیشت، لێ بە سەرخۆم نەهێنا.

بە دیتنی درەختەکانی پێشوازی، شنەبای یادەوەری هەڵیکرد و شارێ گرتە و وێنەی منداڵیم بیرکەوتەوە، بەینێ بووکۆیێم نەدیبوو، لە راونانی لەشکری بەعسیش رێم بێرە

نەکەوتەوە، لەو دیـــوی هەیبەســـوڵتان گەڕامەوە و دامەوە دیوی شەقڵاوێ.

لە بن دار و باری یادەوەری مـن لە کـۆچ دابڕابـووم و گەیشـتبوومەوە منـداڵی، لە راسـتی گۆڕسـتانەکەی فەقـێ ئەحـمەد ئەوەی دواتـر بـووە دوا مـاڵی پلـکە شـیرنەکەم و زۆریدی:

+ئەرێ تۆ لە کوێی؟ دەڵێی لێرە نی.

_من....

+ ئێرەش پێدەچێت لە سەر بارکردن بێت.

لە لای گۆڕسـتانەکەوە هەسـتمکرد کـۆیێش جـوولەی تێکەوتووە و بارگە و بنە تێکدەنێ و لەگژە باربکـات، تەنهـا گۆڕەکان بێ خەم راکشاون و خۆیان لە گـوورە نـابەن، ئەو گۆڕستانە دەڵێم کە دڵداری ئەی رەقیب، دوای چەند سـاڵێ لەو کۆچە، دوای نیو سەدە خەوتن لە هەولێـر، هـاتە ئێـرە و خەوتەوە، بەڵام ئەی رەقیـــبەکەی لە دۆڕان و هەڵاتنـــێش نـــاخەوێ، زار لە زاری وەردەگـــرێ و بە رووی ئەنفالـــدا دەگوترێتەوە، ئەو ئەی رەقیبەی زۆر پارت و مەلا، بە ئایەتی

ئەنفـالاوی دژی وەسـتانەوە، بەڵام سـەریان دای لە بەرد و ئەی رەقیب لە سـەرکەوتن و بنکەوتنـدا دەنگـدەداتەوە، ئەو ئەی رەقیـبەی پاشـتر شـاعیرێکی نـاوداریش کە خـۆی رسـکاوی نـاو دێرەکـانی ئەی رەقیـب بـوو، ئەی رەقیبـی هەڵگرتبـوو، بـۆ مەبەسـتی پتـر نـاودەرکردن، سـروودێکی نووسی و ئاوازێکی خۆشیشیان بۆی دانا، ویستیان جێـی ئەی رەقیب بگرێتەوە، بەڵام تاهـ و واهـا! ئایەت نەیتوانی جێـی ئەی رەقیب بگرێتەوە، شیعر؟!

لە لای یـانەکەوە بۆمـان روونبـۆوە کـۆیە نەک لە سـەر بارکردنە، هەندێ گەڕەکی رەنگە لە هەیبەسوڵتانیش ئـاودیو بـووبن، لە هەنـدێ ترۆمبێلیشـەوە (ئەی رەقیـب و وا هـاتن پێشمەرگێت مە) لە یەکتریان وەردەگرتەوە.

لەو خـولگەیەی ئەگەر دەسـتی راسـت بگـری دەتبـاتەوە لای ئاشەکەی مـام خـدر، ئەو مـام خـدرە دەڵـێم کە بسـتێ منداڵ بووە، بۆتە هاوڕێی جغارە و بادە و لێیان نەبـۆتەوە، بە دەم پێـــک و دووکەڵەوە سـەدەیەکی ئەو شـــارەت بـــۆ دەگێـڕێتەوە، بە قسـەی خۆشـی بـێ، یەکەم کەس بـووە، بە مەسـتی و بە دەنگـی بڵنـد، ئەی رەقیبـی گوتـووەتەوە، لەو خـــولگەیەی ئەوێ، ترۆمبێلـــێ چـــوار پێـــنج چەکـــداری

منداڵكاری له سەر بوو، له راست ئێمه راوەستا:

+ئەگەر دێن بۆ شەڕ، سوار بن.

-شەڕ له كێ لایه؟

+حوكمەت هێرشی هێناوه بۆ هەولێر.

- واته نەگەیشتۆته هەولێر؟

+ نا

-كێ وای گۆ؟

+رادیۆ

هاورێكەم گوتی:

رادیـــۆ خـــواردی! كـــوڕی بـــابم، هەولێـــریش وەك كەركووك به بن گونی بەرەدا چوو، هەولێر چـوو، كـۆیێ بپارێزن.

زانیان به راستمانه، له شوێنی خۆیـان سـووڕانەوه و پێیـان پێوەنا.

لەوێ ئەوەم بیرهـــاتەوه، لەشـــكر قوشـــتپەی بڕیبـــوو،

گەیشتبووە بن هەولێر، هەندێ چەکدار دەیانگۆ:

دەچین کەرکووک ئازاددەکەینەوە.

هێی لە خۆم خەیاڵ پڵاوێ، من دامنابوو لە گەڕەکی بەفری قەندی لادەمە ماڵی پلکە شیرنم، ئەو ژنەی لە قەند شیرنتر بوو، تا گەدە هەڵدەگرێ شفتەی دەستی وی بخۆم، وای لەمێژە شفتەی دەستی ویم نەخواردووە، لە دەمی راونانی لەشکری ئەنفالیش، لە چنارۆکەوە بیرم لە شفتەی وی دەکردەوە، مخابن، تامم نەکردەوە.

گۆتمە هاوڕێکەم:

با سەرێ لە ماڵێ پلکم بدەین، بەڵکوو هێشتا دەرنەچووبن.

هێی! کۆڵانەکانی بەفری قەندی بۆنی خوێنیان لیدێ، چۆل چۆل، تاق و لۆق لە سەرەکۆڵانان کەسی دەردەکەوێ و تیژ تێدەپەڕێ، هاتینەوە سەر جادە، قل قلە دووکان ماوە، هێشتا دەراب و دەرگەیان دانەخستووە، هەندێ کێک و لوقم و شتمان کڕی، مزگەفتی گەورەش دەرگای لە سەر پشت بوو، لەوێ پشووێکی باشمان دا، لەو ناوە بیرمنایەتەوە

چەند ماینەوە و ئەو ماوەیەمان چۆن تێپەراند، ئاخر شـنگ و تینمـان تێـدا نەمـابوو، هێڕوهـوڕ بووبـووین، رەنـگە لە بـن دیواریَ پاڵکەوتبین و خەویَکـی باشـمان کردبـیَ، بـۆیێ ئەو دانە رۆژە، ئەو شەوە، ناکەونە ناو گێڕانەوەوە.

لە بەری زێـــوە، لە بەری تەقـــتەقەوە دەنگـــی تـــۆپ نزیکبۆتەوە.

ئێستا لە بن پەیکەرەکەی حاجی قادر، لە چاوەڕێی نازانم چی دانیشتووین، بیرمە گۆتمە حاجی قادر:

دەمـیَ بـوو تاسـەی دیـدارتم دەکـرد، بەڵام خـۆزی لەو دۆخە نەمدەدیتی.

لە سێبەریَ سەر و جەمەدانیی حاجی دانیشـتووم، ئەویـش تاو نا تاویَ دەکەوێتە بن سێبەری پەلە هەوریَ، لەو کـۆچە، هەر پەلە هەوریَ بەری ئاسـمانی دەگـرت، وەک ئەوە بـوو هێزیَ لە لەشکری ئەنفال سەر چیای لێگرتبی، دەوری دابی، هەر دڵـۆپە بـارانیَ گـوللەییَ بـوو لە ئاسـمانەوە بـۆ سـینگی کۆچوبار، لەوەتەی کورد هەیە، هێنـدەی ئەو چەنـد رۆژەی کـۆچ رقـی لە هەور و بـاران نەبـۆتەوە، بەرانـبەر ئەنفـال و ئاسمان چەند دەسـتەپاچەین، لە نـزا و پـاڕانەوە، لە جـوێن و تف پتر چیمان لە دەستدیَ.

پەلە هەورێ هەنـــدێ پرووشـــاندی، بـــاش بـــوو زوو هەڵپڕینگاند و کـۆتەڵی حـاجی کەوتەوە بەر تـاو، سـێبەری وی لە ســــەر مــــن دەرکەوتەوە، خـــۆر دەردەکەوێ و بزردەبێتەوە، کەوەرۆژە ئەوڕۆ.

ئـــــێمە لەوێ دانیشـــــتووین و چـــــاودەگێڕین و گوێهەڵـدەخەین، بـزانین داخـوا چـی دەبـێ، بەرە لێـرەش هەڵدێ، یـان پـێ دەچەقێنـێ و بەرگـری دەکـات؟ دەترسـم ئێرەش بە دەردی هەولێر ببات.

جـادە هەنـدێ چەکـداری تێـدایە، چەنـد ترومبێلێکـی چەکدار جرت و فرتیانە، ئەی رەقیب و سروودیان خسـتۆتە سـەرێ، دوو سـێ هـاوڕێی خۆمـانم دیـتەوە، ئەو کـوڕانە پاشترێ لەگەڵ کوڕەکەی ئایشەگوڵ تیاچوون، گوتیان:

چ پێناچێ بەرە بەرگری بکات.

لە بڵنـدگۆی مـزگەفتەوە هاتوهـاوارە، بە سـێ دەنگـا گازدەکات:

کوڕانی کۆیێ، کـوڕانی حـاجی، بەرگـری بەرگـری، تـا دوا دڵۆپە خوێن بەرگری...

زۆری نەبــرد هەنــدی لەوانەی لە بڵنــدگۆوە بەرگریــان دەکرد و دەبابەیان تێکدەشکاند، سواری ترۆمبێـل بـوون و بەر لە هەمووان لە هەیبەسوڵتان ئاودیو بـوون، بەر لەوەی بە هەیبەســوڵتاندا هەڵبگەڕێــین، لە شــێوەی تارمــایی خەون، هەنـدێ وێـنە سـەرەدیقانێ دەکەن، وا باشـە لە بـن تیشـکی گێڕانەوە روونتریان پێشانبدەمەوە:

لە خــولگەی حــاجی بە بەری بایزاغــاوە ترۆمبێلــێ راوەســتابوو، ســەر و نــاوی لە ژن و منــداڵ زەرد و ســۆر دەچـۆوە، دەتگـۆ دەچـنە سـەر بـووکێ، تـرۆمبێلەکەی رێـم بیـرکەوتەوە، ئەوەی لەو دیـوەی هەورازە نەفـتە کوژابـۆوە و ژنە رەقەڵەکە چاوی لە سەرم هەڵنەدەگرت، دڵم گۆتی:

هەبێ نەبێ ترۆمبێلی گۆرینە.

لێیان نزیکبوومەوە، خۆی بوو، ژنە لە پێشـەوە دانیشـتبوو، تیچاوێکم دایـێ، هەستمکرد ئەویـش لە بـن چـاوانەوە لـێم دەڕوانێ، خوایە، ئەو ژنە کێیە؟

نەنــاس نـیە و ئاشــنایە، بـۆ بیرمنــاکەوێتەوە، وا چــاکە چــاکوچۆنیی لەگەڵ بــکەم، بــزانم مــن یــان ئەو یــان هەردووکمــان بە هەڵەدا چـووین، یـاخود یەکتـر دەناسـین؟ بچم، نەچم...

لەگەڵ خۆم لەو مشتومڕە بووم، ترومبێل گڕەی هات و ڕۆیی، لەبیرمە دڵم بەوە خۆش بوو کە ترومبێلەکە لە هەورازەکەی وێرێ بەجێنەمابوو، ئەوەتا گەیشتۆتە ئێرە و لێرەوەش بۆ هەیبەسوڵتان، چەندی مێشکی خۆم گوشی بیرمنەکەوتەوە ئەو ژنە کێیە و لە کوێم دیوە، دەی، وازی لێبهێنە.

دوا گرتەی ناو بازێڕی کۆیێ:

پیاوێ لە جلک و بەرگ و سەروقژ و جوولەی دەستی بە شێت دەچوو، بەڵام لە قسە نا، پڕ بە زاری:

شەرمە ناچنە شەڕێ، جاشی گەورە بێتەوە، یەک یەک سوارتان دەبێ.

ئا، دوو چەکدارەکەشم بیرکەوتەوە:

لە جادەکەی بن گردی جووان، دوو چەکدار پیس لێکدی دارِسابوون، تفەنگیان لێکدی راکێشابوو، خوێن بەر چاوی گرتبوون، سێ چوارێ زوو کەوتینە ناوبژی، دەنا خوێن دەڕژا، کاتێ پێکەوتم شەڕ لە سەر چیە، هێندەی نەما لە ناوبژیکردنێ پەژیوان ببمەوە، ئەو شەڕە لە سەر هاتنەوە و نەهاتنەوە بوو، یەکیان دەیگۆ:

حوکمەت دێتەوە شار.

ئەویدی:

چاوی بە شار ناکەوێتەوە.

زۆری نەبرد لە پێچەکانی هەیبەسوڵتان هاوڕێکەم گوتی:

ئەها ببینە ئەو دوو تفەنگچیەی بە شەڕهاتبوون.

دەبینم لە پشتی پیکابێ لە تەنیشت یەک دانیشتوون،
ئەها ئێمە لە دۆران و هەڵاتنێ چەند دۆستین!

-٧-

بە دەم بای کۆچەوە

لە پووشکاخەزی داو پساو دەچم

داخوا لە کوێ دەکەومەوە،

لە چ پنچکێ گیردەبم و

بە چ بەزمێ دەچم

لرمه و زرم و هۆڕی تۆپـان زۆر نزیـک بـۆتەوە، ئەوەتـا گەیشـــت، هەیبەســولّتان چەنــد تــۆپێکی گــرتەوە، وەک زەویلەرزە لێدابێ لەرزی، تۆز و دووکەڵ تێکەڵ بوون، ئێمە بە پێی پێشمەرگە ڕێ و ڕێ هەڵدەگەڕێین، هەیە قەدبڕ چیـا دەبڕێ، بەوەی باشە هەیبەسولّتان ژن و منـداڵێکی وای پێـوە نیە، پێدەچێ پـێش ئـێمە ئـاودیو بـووبن، پیـادە کەمە و نـاوە ناوە تڕومێلێ تێـدەپەڕێ، لەوێ، لە سـەر پشـتی پیکـابێکەوە، ئەو خزمەم دیتەوە کە خـاوەن تفەنـگەکەی شـانمە، ئەویـش منی دی، بە ئاماژەی دەست تێمگەیاند:

ئێوە بڕۆن، خەمی منتان نەبێ.

لە ســەر ســەرێ دەنگــی تەقە دێ، وا دیـارە پێشــمەرگە دامەزراون، ئیدی لێرەوە بە لەشکری ئەنفال دەڵێن:

بوەستە.

هەر دەبـێ وابـێ، ئەگەر لە هەیبەسـولّتان بەرگرینەکـرێ، نـابێ تـا بنـاری قەنـدیل ئاوڕبـدەینەوە، مەتارەمـان پـڕە و کۆڵەپشـتیش خـواردنی تێـدایە، فیشـەکدانیش پـڕ فیشـەکە، شەڕیش هەر هێنـدەی دەوێ، ئـێمە لە دڵـی خۆمـان سـەری هەیبەســولّتانمان بە دوا پنتـی هەڵاتــن دانـابوو، ئێـدی لێــرە

دەچەقــین و ســەنگەر دەگــرین و راونــانەکە بەرەواژ دەکەینەوە.

هێشتا بەم دیوەی هەیبەسوڵتانەوە بـووین، دەبـابەی ئەنفـال گەیشتە بەری هەرمۆتە، لەشکر گەیشتە شار.

هێندەی نەبرد، چیا چەکداری پێوە نەما، ئیـدی بە دیـوی چنارۆکدا شۆڕبووینەوە، لە دڵێ خۆ گۆتم:

قەندیل، ناوزەنگ، دێینەوە.

من لە شۆڕبوونەوەدا ئومێدبڕ بووم، ورەم دابەزی و هێزی پووشـکەیەکم نەمـا، لە دەسـت خـۆم نەمـاوم، دەمـێ پووشـکاخەزێکی داو پساوم، کـێ دەزانـێ لە کـوێ دەکەومەوە و لە چ پنچکـێ گیـردەبم، دەمـێ تـاوێرێکی غلۆربۆوەم، داخوا لە چ کەند و کەندڕێ دەگیرسێمەوە، دنیا لە بەر چاوم وا تاریک داهـاتووە، بە بڵێسـەی چ راپەڕیـن و شۆڕشێ رووناک نابێتەوە.

ئەو شەوە خۆزیم خواست بەر لە بیست و هێنـدە شـەوە لەگەڵ ئەو هاوڕێیەی ناوی شۆڕش بوو، شۆڕشێکی دەهێنا و گیـانی لە پێنـاو کـۆیێ دانـا، منـیش بە گـوللەیەکی جاشـی

گەورە سارد دەبوومەوە، ئەو جاشەی هەینێ بە خۆی و دەستەیەوە بە پەند چوون، هەوکەش دوورنیە دەستەکەی لە خولگەی حاجی قادر لەگژ وێنەگرتنی سەرکەوتنی ئەنفال بن.

خۆزیم بە ملازم شێرزاد خواست، چاوی بەرایی نەدا و رێی دانەگرت، کەرکووکی بۆ لەشکری ئەنفال جێنەهێشت، پێی چەقاند و خۆی بۆی بە کوشت دا، خۆزیم بە خەجە باوە و مامۆستا بارام خواست لە سپێدەی ئازادی خۆیان کردە جانگۆریی قەڵات و منارە، هێشتا هەواڵی جەرگبڕی راوێژ و براکانیم نەبیستبوو، خۆزیم بە وانە خواست زوو گەشمردە بوون و ئەو رۆژە رەشەیان نەدی.

هاورێکەم دیاربوو هەستی بە داڕووخانی دەروونی من کردبوو، قسەی خۆش و ناسکی بۆ دەگێڕامەوە، بەڵام من وەها نەڕووخابووم بەو قسانە هەستمەوە.

بیرمنایەتەوە چۆنچۆنی لە هەیبەسوڵتانەوە لێژ بووینەوە و گەیشتینە دووریانەکە، لەوێ لە دەستی راستەوە لە بەری دووکانەوە خەڵک دەهات، وا دیارە ترس گەیشتۆ ئەوێش، دەستی چەپمان گرت و بڕۆ.

ئێـره وا تێـبگەم پـردی هیـزۆپە، لە پشـتمانەوە لە بەری هەیبەسولتانەوە، گڕ و هۆڕ و دەنگی تۆپە، بەڵام پێشـمان وا دیاره ئارامە، کۆچ رێـی خـۆی گرتـووە، لێـرەش گـوێم لە دەنگی(هەڵێ هات)ە، وا بڕوات لە کێوەڕەش ئاودیودەبین.

نەرم نەرم، دەو جادە و جادە هەڵدەکشێین، بە دەم رێـوه خەوەنـووتکە دەیبـردمەوە، خەیـاڵ دەیبـردمەوە، رەنـگە وڕێنەشم کردبێ، وەک بڵێی بە سەر دنیاوە نەبـم، وێـدەچێ لەو رێیە زۆر شت روویدابێ، زۆر گرتە و وێنەی جیا جیـام لە دەستچووبێ.

ئەرێ چ کـاتە، دەمە دەمـی ئێـوارەیە، ئـانژی بەرە بەری رۆژهەڵاتە؟ وا پردی هیزۆپمان بڕی و بەرێی رانیەدا کەوتینە رێ؟ وا تێبگەم گەیشتبووینە بن کانی مارانی وێران، ئـا، ئەو ناوه بوو.

هێندەم وەبیردێتەوە بە شێوەیێ سەرلێشێوا و گێژ بووبووم، وەک بڵێی لە دەرێی کات رێـبکەم، شوێنیشـم نەدەناسـیەوە، ئاگـام لەکـۆچیش نەمـا، تـا ئەو شـوێنەی تووشـی سـووزی بووین، نازانم چۆن هاتووین.

سووزی، بەغـدایەکی کریسـتانی بـوو، دوو سـێ وەرزێ

بەر لە وەرزی راپەڕیـن، بەر لە راونـانی لەشـکری ئەنفـال بە خـۆ و مێـرد و شـووبراوە، هـاتبوون و وەک ئـێمە بە چیـا کەوتبوون و لە ناوزەنگیٚ گیرسابوونەوە، بـۆ ناسـینەوەی ئەو ژنە، لە نـاو (گوڵەسـتێرەکان...) بـگەڕێ و ناسـکە رێواسـێ ببینەوە.

-٨-

هەواڵ دێ

ژەقن ژقن، تاڵ تاڵ دێ

لە ئاقاری بن دەستی لەشکری ئەنفال دێ

بایێ هەڵیکرد، لە هی پێش باران دەچێ، سەرم هەڵبڕی هەورێکی تیری هێنا و بنی تاریکە، یاری ناو گۆرانیەکەم لادا و میللەتم لە جێی وی دانا و بۆخۆمم گوتەوە:

هەورێکی هێنا، بارانەی پێوە

یاخودا دانەکا، میللەت بەڕێوە

بەڵام بە دەردی ژنەکە گۆتەنی:

خودا گوێی لە پارانەوەی کورد نیە.

ئەو ژنە لە دواوەی ترومبێلێکی سەر کراوە دانیشتبوو، ترومبێلەکە لە کار کەوتبوو، سەرەتا بە زمانێکی نەرم لە خودا دەپاڕایەوە، دوایی کردیە گللەیی، زۆری نەبرد کەوتە جوێندان، ئێمە بەجێمانهێشت، نازانم گەیاندیە چی و بە کوێ گەیشت.

لەو رێوبانە پیادە کەم و سوار زۆرە، ناوە ناوە ترومبێلی و تیژ تێدەپەڕێ، ئێمە ماندوو مردوو، بارانیش نەرم دەپرووشێنی.

لە شوێنێ کەمێ گەوە بوو لە سەر ترومبێلێکەوە

دەنگێکــــی ناســـکی ژنـــانە بە عـــارەبی گـــازیکردین، سەرهەڵدەبڕین سووزی خۆمانە، کچە کریستانیە بەغدایيەکە، ئیدی لەوێ لەو شوێنەی هێنـدەی نەمـابوو بـۆ چـوار قـوڕنە، ئەو هەرێیەی بە خۆمان دابوو بە پێی کـۆچی نەتەوە بـڕۆین، شکاندمان هەرێکەمان شکاند، بەڵام بە قسەی هاوڕێکەم بێ، هەرێ شکان نەبوو، گوتی:

ببینە، لەو ناوە ژنێ، منداڵێ نابینی پیادە بێ.

وا بوو، لەو دەمەی ئـێمە سـواربووین، لەو جـادەیە پیـادە نەدەبینرا، ئیدی ئێمە لە ناو هەولێـرەوە تـا ئیـرە بە پێیـان و بە پێی کۆچی نەتەوە هاتین، بیرمدێتەوە سووزی بە دیتنی ئـێمە وەک گوڵ گەشایەوە، دەستی پێشادبوونەوەی گوشین.

لە ناو ئەو ترومبێلە هەندێ هەواڵی هێند جەرگبڕم بیست، خۆزی نە سوار دەبووم و نەدەمبیست، بە قەد شـارێ خەمـم خوارد، بۆوەی ئێوەش نەکەمە هاوبەشی خەمەکە، تەنها دوو هەواڵیان پێشاندەدەمەوە:

راوێـژ ئەو کـوڕەی لە شـار هـاوگەڕەک بـووین و لە شـاخیش هـاومەتەڕێز، دواجـاریش لە سـپێدەی هەڵاتنـێ لە سەر پردەکەی سەیداوە دیتم و نازانم چۆن بوو لێکـدابڕاین،

ئەو کوڕە بە خۆو سێ برا و ئامۆزایەکەوە، لە بن شار لە بەرەنگاربوونەوەدا، بە دەستی لەشکری ئەنفال، خوێنیان تێکەڵ یەکتر دەبێت، پێشتریش برایەکیان لەو دەشتەی خوارێ هەر لە ریزی کۆمنیستان دەبێتە بەڵاگێڕی شار و نیشتمان، بەوە ژنێکی گەرەکی بەلاشاوە دەبێتە دایکی پێنج پێشمەرگەی شەهید.

هەر لە بن شار تۆپێکی ئەنفال دێ و بە تڕومبێلێ دەکەوێ و لە خێزانێ یان دوو، نۆ کەس دەسووتێنێ، گیانیان دەبێتە پەپوولە و لەشیان دەبێتە ڕەژوو.

دواتر، زۆر دواتر، کەسوکاری نۆ سووتاوەکە، مزگەفتێ قیت دەکەنەوە، لە سەر دەرگاکەی دەنووسن:

مزگەفتی نۆ شەهید.

بیرمدێتەوە، پیرێکی زۆر لە خوداترساو، گوتبووی:

تا نۆ شەهید هەبێ، من لە هیچماڵێکتری خودا نوێژ دانابەستم.

تۆ بڵێی هەر کێ ڕێی بە بەر دەرگای نۆ شەهید بکەوێ، نۆ شەهیدەکەی بیربێتەوە؟

بەڵام دایک و پێنج کوڕە شەهیدەکەی، لە سەر لادیوارێکیش ناویان نەنووسرا، ناویان لە ناو ناوان نەما، زوو بزربوون و بیرناکەونەوە.

هەواڵی لەو شێوەم زۆر بیست، من نا، دەبێ دیرۆکنووسێ بیاننووسێتەوە.

ئێ، بە بن باراندا گەیشتینە چوارقوڕنە، لەوێ بەبیرمنایەتەوە لە سۆنگەی چیەوە بوو لە سووزی و ئەوان دابڕاین، ئەو شەوە لە ماڵی کۆنە پێشمەرگەیەک ماینەوە، دوای ئەو چەند شەو و رۆژە لەوێ تێرمان بە زگی خۆمان خوارد و حەساینەوە و خەوتین، وای چایەم خواردەوە، ئەگەر ئەو چاکانە بژمێرم کە هەرگیز ناتوانم بیاندەمەوە، یەک لەو چاکانە، چاکانی ئەو ماڵەن، لەگەڵ ئەو پێشمەرگەیە دوو ساڵ بەر لەو شەوە لە سەر لووتکەی چەکوچی قەندیلێ بە یەکەوە بووین، ناوی وی شاڵاو بوو، ناوی ئەو کوڕە بە هێستردۆست چۆتە ناو (گوڵەستێرەکان...).

ئەو شەوە بە سەربردەکانی دایکی شاڵاوی هێستردۆست خەومان لێکەوت، سەربردەکانی ویش هەموو دوو سێ

سەربردەی زۆر کورت بوون، بەڵام هەر یەکەیانی سەد جار وەک خۆی بێ پاش و پێشکردنی یەک رستە و وشە دەگۆتەوە، کوڕە زوو گوتی:

دایکم چەند رۆژێکە بایی کەوچکە شەکرێ پەیوەندی بە ئێستاوە نەماوە، هەر بە جەستە لێرەیە، گەڕاوەتەوە منداڵی، لە خەیاڵێ دەژی، من خۆزگەی پێدەخوازم.

یەک لە سەربردەکانی ئەو ژنە خانەخوێیە گێڕانەوەی دیرۆکی ئاواییەکەیان بوو:

چوارقوڕنە تەنها چوار ماڵ بوو، هەر ماڵەی لە گۆشەیەک ژوورێکیان قیت کردبۆوە، کەپرێکیان هەڵدابوو، هەر یەکە و دوو کەر و شەش حەفت سەر بزنیان هەبوو.

لە کاتی ماڵاوایی، ئەو دایکە بە رستەیێ لە رابردووەوە هاتەوە ئێستا:

چوارقوڕنە پێش رانیە هەستا و لەشکری راونا.

کوڕەش سەری ئەرێی بۆ بادا و گوتی:

دایکم راست دەڵێ، راپەڕین لێرەوە سەریکرد.

ئەو چوار قورِنەیەی سەردەمانێ چوار ماڵ بووە، ئێستا دنیا رووی تێکردووە، خۆیشی وا لە گڕە بارگە تێکدەنێ، ئەو چوارقورِنەیەی بە قسەی ئەو دایک و کورِە بێ، بەر لە هەموو جێ لەشکری ئەنفالی راونا، وا لە سەر بارکردنە، وا بڕوات ئەویش بەگەل کۆچ دەکەوێ.

لێرەش(هەڵێ هات و موجاهید هات)ە، وا دیارە لەشکری ئەنفال تا لە ناوزەنگمان نەکاتەوە، لە دوامان نابێتەوە، گۆتەکەی عادل عارەب وە راست دەگەرِێ و لە ناوزەنگێ دەکەینەوە.

-٩-

لە کۆلان و ڕێوبانێ

چاوم سەرشارە لە وێنەی کۆچبار

لێ مینا خەیاڵ پەرتن و

ناهێنە بەر خۆدیکیٚ پێشاندانێ

بەر لەوەی بەرەو رانیە ببینەوە، هەندێ وێنە و گرتە و گۆتەم بیرکەوتنەوە، تا لە بیرنەچوونەتەوە وا باشە لێرە پێشانیان بدەمەوە:

رۆژێ پێش ئەوەی دەبابە بگاتە قەڵات و بە بەر چاومەوە لەشکری ئەنفال دەوری شار بگرێ، بەرایی کۆچی کوردان لە کەرکووکەوە پێشتر گەیشتبوو، بە سەر ماڵاندا دابەش بووبوون، ژنە کەرکووکیەک کە کەوتبووە کۆڵانی ئێمە، گۆتیە دایکم:

دڵم دەڵێ هەولێریش بە دەردی کەرکووک دەچێ، چەندی زوو بڕۆین باشە.

دایکم گوتبووی:

منیش لە چاوی کوڕەکەم ئەوە دەخوێنمەوە، بەڵام کەس ئەو قسەیەمان لێ وەرناگرێ، روو لە کوێ بکەین؟

لە سپێدەی هەڵاتنێ کوڕیژگەکەی کۆڵانێ مە، ئەوەی گەرەک ناوی شێتی بە سەردا بڕیبوو، ئەو کوڕەی تەنها جگەرەی لە خەڵک وەردەگرت، کۆڵان لە رێی ئەوەوە دڵنیابوون کە کارەساتێکی گەورە بەڕێوەیە، کۆڵان دەیگۆ:

بەر لەوەی رووداوێکـــی گەورە چ خـــۆش چ نـــاخۆش رووبدات، رۆژێ پێشتر ئەو کوڕە هەستپێدەکات و لە ڕێـی هەندێ هەڵسـوکەوت و جـووڵە لە خەڵـک دەگەیەنێـت کە شتێ روو دەدات، ئەو کـوڕە ئایینـدەزانە، بە دوو دەمژمێـرێ بەر لە رووداوەکە لەو سەری کۆڵان بـۆ ئەو سـەری کـۆڵان بـێ راوەسـتان دێ و دەچـێ، پەنـجە و لێویشـی بە شـێوەیێ دەجووڵێنێ، وەک بڵێی شتێ بژمێرێ، ناوە نـاوەش سـەر بـۆ ئاسمان هەڵدەبڕێ، دەنگێکی لێوەدێ، لێ کەس تێناگـات چ دەڵێ، دەڵـێن رۆژێـک بەر لە راوەسـتانی جەنگـی عێـراق و ئێران، رۆژێک بەر لە داگیرکردنی کوێـت، رۆژێـک بەر لە هێرشەکەی بۆش بۆ سـەر سـەدام، رۆژێـک بەر لە ئـازادیی شار، هەمان ئەو جووڵانەوەی کردووە، بۆیێ کۆڵان گومانبڕ بوو کە هەڵاتنە.

ماڵە جاشەکەی سەرە کـۆڵانی ئەوسـەری، کە لەو چەنـد رۆژەی ئـازادی بووبـووە پێشـمەرگە، پێشـتریش وەک لە کۆڵانم بیست، دوو سـەی دڕی راگرتبـوو، هەر بـۆ گەمە و خۆشی لە خەڵکی بەردەدان، ئەو مـاڵە روو خـۆش و دەم بە بزە دیـاربوون، پێـدەچوو خۆیـان بـۆ پێشـوازی لە لەشـکری ئەنفال ئامادەکردبێ.

ماڵێ لە ماڵە عارەبەکانی کۆڵانی پشتمان، ئەوەی نزیک پردی گامێشەوانان، بارگە و بنەیان تێکناوە و لە سەر هەڵاتنن، ژنەکەیان دیاربوو منی دەناسی، پرسی:

لە بارەگای ئێوە چ باسە، هەڵاتنە یان نا؟

گوتم:

کەس نەماوە، هەموو رۆیشتوون.

ویستم بڵێم: ئێوە بۆ هەڵدێن؟ خۆ....

نەمپرسی و رۆیشتم.

لە سپێدەی هەڵاتنێ لە بەری سێتاقانێ کوڕێ رایگرتم، دیاربوو ئەو لە و چەند رۆژەی ئازادی چەند جارێ منی دیتبوو، من نەمدەناسی، دواتر بووینە برادەری زۆر نزیک، ناوی هاشم بوو، یێک لە خوێنەرە هەرە دیارەکانی شارە، گوتی:

لە هەر چەکدارێ دەپرسم:

چیە؟

وەڵامی روون نیە، هەر کەسە و شتێ دەڵێ، هەیە دەڵێ

لەشکر بە خەونیش ناگاتەوە شار، تۆ ئەگەر دەزانی بە راستی بە من بڵێ هەڵاتنە یان نا؟

راستوڕەوان گوتم:

هەڵاتنە، خولەکێ زووتر دەرچن باشترە.

هەر ئەو رۆژە، بیستمەوە، هەندێ پێشمەرگە رێیان لە هەڵاتنی خەڵک گرتووە.

ئەوە پێشەی هەندێ بەرپرس و پێشمەرگەی ناو هەندێ لایەنی بەرەیە، لە ئەنفالی هەشتاوهەشتیش وایان کرد، رێیان لە چەندان ئاوایی گرت و نەیانهێشت دەرچن و بگەنە سنوور، دەرخواردی ئەنفالیان دان، لە قسان لە هەڵەبجەش هەر وایان کردا

هەر ئەو رۆژە بەر لەوەی لە شار دەربچم و رێی کەسنەزان و دڵۆپە بگرم، زۆر کوڕم دی بە تفەنگی شڕەوە، بێ مەتارە و فیشەکدان، لە سەرە کۆڵانان راوەستابوون، لە چاویان بەرگری لە شار دەخوێندرایەوە، زوو پێکەوتم ئەو کوڕانە نە پێشمەرگە بوون، نە پێشتریش جاش، ئەو کوڕانە پارێزەری شار بوون و هیچیدی، پاشتریش بیستمەوە، هەندێ

لەوانە لەو رۆژە بە تفەنگەوە کەوتبوونە بن زنجیری دەبابەی ئەنفال.

لە سەر جادەی شەستمەتری، لە خولگەی کۆشکی باکوور، ئەو کۆشکەی ئەو چەند رۆژەی ئازادی زۆر تامەزرۆبووم تاوێ لێی دانیشم و بە سێ چوار بیرە لە کۆڵی تفەنگ ببمەوە و لە خەیاڵێکی ناسک باڵ بگرم، مخابن، بە جێمهێشتەوە و رێک نەکەوت، لەوێ لەو خولگەیە، ئەو جێیەی دواتر پەیکەری ئەو رۆژنامەنووسە بیانیەی لێ دانرا کە لە نێوان ئازادی و کۆچدا بە دەستی لەشکری ئەنفال شەهید کرا، لەوێ، چوار پێنج چەکداری منداڵکار لە سەر ترومبێلێ بەدەم گۆتنەوەی ئەی رەقیبەوە، هاواریان لە خەڵک دەکرد:

هەڵمێن، شار بەجێمەهێلن، ئێمە شەڕ دەکەین، دەبابە پانمانبکاتەوە، شار چۆلناکەین.

ئەو کوڕانە چەند گەرم بوون، بەڵام بە چی دەچێ!

هەر لە جادەی خڕی شەستمەتری لە سەر بانی چەند ماڵێکەوە رووە و ئاسمان ئارپێچی دەهاوێژرا، دەنگی هاوەنیشم بیست، هەبێ نەبێ، ئەوانە جاش و پیاوی

حوکمەتن، بۆ ترسـان و سەرلێشـێوانی خەڵـک تەقە دەکەن، لەوێ، لە بەری گەڕەکــی میرپێــداوان، دوو فیشــەکمان بە شوێنی ئارپێچیهاوێژێکەوە نا، دەنگی بـڕا، ئەو شـوێنە دواتـر بەرپرسێ خەستەخانەیەکی لێ قیتکـردەوە، خەڵکـی هەژار و نەدار داهـاتی مـانگێکی بەشـی مـانەوەی شـەوێکی ئەوێـی نەدەکـرد، ئەو بەرپرسـە لە راونـانی لەشـکری ئەنفـال رۆڵـی هەبوو، لە سپێدەی ئازادی پاش من گەیشتەوە نـاو شـار، لەو هەڵاتـنەش کە وا لەشـکر راومـان دەنـێ، نـازانم گەیشـتۆتە کوێ.

هەر لەوێ، لە ســەر پــردی ســێتاقانێ لە ســەربانێکەوە فیشەکێ هات، بە بەر چاومەوە شـوفێرێ بە شـان گـرتیەوە، رایگرت، وێدەچێ برینەکە سووک بێت، یان گەرماو گەرم بێت و هەست بە ئازار نەکات، هاتە خوارێ و جێـی خـۆی لەگەڵ کەسەکەی تەنیشتی گۆڕیەوە، تیژ دەرچوون.

لە پێش دەرکەی گەورەی خەسـتەخانەی سـەدام، ئەوەی دواتـر نـاوی گـۆڕا بـۆ رزگـاری، قەمەرەیـێ پێشـەکەی هەڵدرابۆوە، ئەفەندیێ بە دیـاریەوە لە چۆکی خـۆی دەدا و پەکوو پەکووی بوو، هاتە پێشمان:

ئەرێ کاکە، ئێوە شتێ لە ترومبێل نازانن؟

من گوتم:

بە داخەوە هیچی لێنازانم.

هاورێکانیشم هەر هێندەی منی لێدازانن، یەکیان گوتی:

ئەگەر دەڵێی تا پاڵیبدەین.

گوتی:

نا، بە پاڵدان هەڵنابێ.

منداڵەکانی دەتگوت لە سەر پۆلووی ئاگرن، هەڵدەپەڕین، دوو سێیەک پێکەوە:

بابە، زوو دەی زوو پێیکە، دەبابە گەیشت.

ژنەکەی لە سینگی خۆی دەدا:

قوڕی کوێ بە سەر خۆدا بکەین، دەگیرێین.

ئەفەندیەکەم ناسیەوە، مامۆستا بوو، زوو چەند مانگێ وانەی پێمگوتبوو، بە دڵی پڕ خەمەوە بەجێمانهێشتن، تۆ بڵێی دەرچووبن؟

نەختێ سەرتر لە بەری چەپی جادە لەو شوێنەی چەند ساڵ پاشتر کابرایەکی نازانم کێندەری، تەلارێکی چەند نهۆمی بەرزکردەوە، پێشی پردەکەی گرت و بە نێرەکەری نەیهێشت سووڕانەوەیەکی پێویستی پردەکە بەوێدا بسووڕێتەوە، لەوێ ژنێک بە دارشەقەوە هاواری بە سەر کوڕیژەگەیەک و کچێکی پارچەڵەدا دەکرد:

بڕۆن، کچم، کوڕم، ئێوە خۆ دەربازکەن، خەمی منتان نەبێ.

دیاربوو کچە و کوڕە نەیاندەویست دایکیان بەجێبهێڵن، بە گریانەوە:

دایە، ئەدی ئەتوو؟

دایک:

کەس هیچ لە من ناکات، زوو هەڵێن، تا...

بەجێمان هێشتن و نەمانزانی دایکیان بە جێهێشت یان مانەوە.

لە رێی کەسنەزانێ، زۆری نەمابوو بگەینە راستی ئەو

کەلەکە بەردەی تـا هەینـێش خـوێتی کەریـم و سـتی دەگێڕایەوە، کچێ لە نزیکە مە وێنەی ئێمە لەگەل لـوورەی تـۆپ ئەو تۆپـانەی لە بەری بنەسـراوەوە دەهـاتن، خـۆی بە عەرد دادا و لە سەر چاو کەوت، چەندی گازیان کرد:

ستی، کچێ ستی، هەستەوە...

کاتێ هەستاوە، رێی شاری گرتەوە، پێدەچوو کەسێکی نزیکی لەبیرکردبێ، رەنگە ناوی ئەو کچە کە نەمزانـی چـی بە سەر هات، بە هۆی ستیەکەی کەریمەوە لە یادگەم مابێت و نەسڕابێتەوە.

لە راستی کەندڕەکە ئەو کەندڕەی حوکمەت دەمێ بـوو بە هەر چوار دەوری شاردا لێیدا بـوو، لە ترسـی دزەکردنـی پێشمەرگە شاری خستبووە ناو بازنەی کەنـدڕێکی قـوولەوە، ئا، لە راستی ئەو کەندڕە سێ چوار تۆپێ بە دوای یەکدا لە نزیـک جـادە کەوتـنەوە، کـاروانی کـۆچی پسـاندەوە، ئـێمە پشـتاو پشـت بەرەو شـار گەڕایـنەوە، بـۆ تـاوێ نێـوان هەلاتووەکـان و گەڕاوەکـان بۆشـایی تـێکەوت، ئەهـا دەبابەکـان زۆر نزیکبـوونەتەوە، ئەگەر وا بێـنە پێشـێ و شتێکیان نەیەتە پێشێ، دوو خولەک نابا، دەگەنە سـەر جـادە

و ڕێ دەگیرێ، ئێمە پێمان پێوەنا و بەکەلێنی تۆپاندا گەیشتینەوە کۆچ، ئاوڕمان دایەوە، هەندێکیتریش بە دواماندا هاتن، وا دیارە هێشتا لەشکر نەگەیشتۆتە سەر جادە، تا بن کەسنەزان یەک پشی هاتین و ئاوڕمان نەدایەوە.

لە ڕاست ئەو جێیەی پاشتر کەسێ تەلاریێکی وای لە سەر هەڵنا، سەدام خەونی پێوە دەدی، ئەو کەسە خۆی نا، بابیشی باشووریان نەدیبوو، لە یەکەم گوللەی ئەیلوولەوە پەراکەندەی ڕۆژهەڵات بووبوون و لەوێ نازانم چ ژیانێ دەژیان، لەو ڕاستە لە تۆپێکەوە لەو تۆپانەی لە بەری بنەسراوەوە لەشکر بە کۆچیەوە دەنا، ساچمەیێ هات و هەڵبەزیەوە و بە ژنێ کەوت و کەوت، ترومبێلێ ڕایگرت، ژنەی بریندار و ئەو پیاو و منداڵەی لەگەڵی بوون هەڵیگرتن و فڕین.

لە ناو ترومبێلان تەنها ئەو ترومبێلەم دی، جێی بەتاڵی هەبێ، هەر ترومبێلێ تێدەپەڕی، دوو هێندە، سێ هێندەی خۆی هەڵگرتبوو، قەمەرە هەبوو لە سەر ساپیتەکشی چەند کەسی بارکردبوو.

لەو ناوە لە دەو ڕێ پیاوێ لە سەر پشت ڕاکشا بوو،

جـوولەی لێبـڕا بـوو، لامانـدا سـەری، کەسـێ دانەویەوە و دەستی خستە سەر سینگی، گوێی بە دڵیەوە نا، دوای تۆزێ:

گیانی تێدا نەماوە.

پیاوێ گەیشتە سەری، سەری بەرزکردەوە:

ماڵی کاولم، خۆ ئەوە ... ە

نـاوێکی گـۆت، ڕۆژی ڕاوەسـتان بە دیـار تەرمەوە نـیە، لەشکر بە دوامانەوەیە، ڕێمان گرت و پێمان هەڵێنا.

لە سەرگۆماوەکە تۆ بڵـێ بەنـداوەکە، ئەوەی کەسـنەزان، ئەوەی زوو زۆر زوو هاوینان لە شارەوە دەهـاتین و خۆمـان پیێدا دەدا، یەک دوو منداڵیشـی تێـدا خنکـا، تـۆپێ لەو بەر کەوتەوە و گەردەلـوولێکی لـێکەوتەوە، هێشـتا تـۆپەکە نەتەقیبۆوە کوڕێژگەیێ لە ترسا سـەراو سـەر خـۆی پێـدادا، دیـاربوو مەلەوانیشـی نەدەزانـی، دوو کەس زوو گەیشـتنێ، وەرنا ئاوەوئاو دەچوو.

لە کـــوێ لە کەســـــنەزان دەردەچـــــی، لەوێ بە بەری ڕووبارەکە ژن و پیـاوێکی بە تەمەن، زۆر بە تەمەن، دەسـت بە گۆچان نەرم نەرم بە پێێ مراویی باڵشـکاو ڕێـی کۆچیـان

گرتبووە بەرێ، ژنەکە لە پێشەوە دەڕۆیی، ژنە دەڵێ:

پیاوەکە، نەختێ پێ هەڵێنە.

پیاوەکە:

لە سەر بەردێ دانیشە، بێنم تەنگ بووە، با بێنێ بدەین.

ژنەکە:

کاتی دانیشتن نیە، لەشکر نزیکە.

پیاوەکە:

کچێ لەشکر چی بە سەر ئێمەوەیە؟ پسام، دانیشە.

ژنەکە:

بیرتچوو، ئەوێ ساڵێ چەندی لە تەمەنی من و تۆیان راپێچا و کەس نەیدیتنەوە؟

دیاربوو مەبەستی ئەنفالی سێ ساڵ لەمەوپێش بوو.

لە تەنیشت یەکتر دانیشتن، گریانم بۆیان هات، بەجێمهێشتن، پێدەچوو ئەو دوو پیرە هی ئاوایی کەسنەزان بووبن، هی ئەوە نەبوون لە شارەوە گەیشتبنە ئێرە.

لە سەر ئەو ڕێیەی دەچێتەوە شەرەبۆت، مەبەستم ئەو زوورگ و گوندەیە کە کانیەکی هەبوو لە چلەی هاوینێ ئاوێکی دەدایە ئاوایی، سارد سارد، روون روون، دەتگوت ئاوی ناو جەڕەیە، ئەو جەڕە مل باریکەی شاری لە شەوانی هاوین لەگەڵ خۆیان دەبردە سەربانێ، لە سەر ئەو ڕێیە پیاوێکی رەقەڵەی بەژن مام ناوەنجی، بڕنۆیەکی درێژی ژەنگاویی بە شانەوەیە، رەنگبێ لە ئاشبەتاڵەکەوە خستبێتیە بن خۆڵەوە و لە رۆژی ئازادیی شار هێنابێتیەوە دەرێ، بە بڕنۆوە قیت لەوێ راوەستاوە و دەستێکی بۆ لای شەرەبۆت درێژکردووە و پڕ بە گەرووی هاواردەکات:

خەڵکینە، لەگەڵەنگۆمە گوێدەنێ، بێرەدا بێرەدا، ئەو ڕێیە دوورە لۆ دەبڕن؟ دەچنە کوێ، وەرنە ئەو دۆڵە، وەرنە شەرەبۆت، سەر وماڵتان پارێزراوە...

بە سەری پەنجەی گەورە و تەنیشتی پەنجەی دۆشاومژەی لایەکی سمێڵە درێژەکەی خۆی دەگرێت و دەنگی بەرزتر دەکاتەوە:

ئەو مووە لە پیاوان نەهاتبێ، ئەگەر هەمووتان نەپارێزم، مەترسن، ئەو بڕنۆیەم دەبابە و کۆپتەریش تێکدەشکێنێ، بە

قسـەم بـکەن، لادەنە مـاڵی ئـێمە، لادەنە شـەرەبۆت، خۆتـان مەدەنە دەستی سەرما و برسێتی.

پیاوێ خۆی لێ توورە کرد:

شێت و شـوور، ئەوە تـۆ چ دەڵێـی، بـڕۆ خـۆ دەربـازکە، دەبابە وا گەیشتە بن قوونت.

کـابرای بڕنـۆی ژەنگـاوی لە شـان، کـابرای دەرگـاوانی شێوی شەرەبۆت لە سەرەخۆ:

من شێت نیم تۆ شێتی، بەرە شێتە کە فیشەکێکی نەتەقاند و کلکی لە گەلۆزێ ناو تێیتەقاند.

عادل عارەب کاتێ تێگەیشـت دەرگـاوانی شـەرەبۆت چ دەڵێ و چ لەو خەلکە دەخوازێ، گۆتەیەکی نزیـک لەوەی گۆت:

وا دیارە کوردیش دۆنکیشۆتی هەیە.

لەو قسەیەوە منیش وێنەی ئەو پیـاوەم بیـرکەوتەوە کە لە سەر کتێبـی دۆنکیشـۆتی سێرڤانتس کێشـرابوو، هەستمکرد دەرگـاوانەکەی شـێوی شـەرەبۆت زۆر لە وێـنەی سـەر کتێبەکە دەچێت.

له کانیەکەی دلۆپە لە گڕ پڕکردنی مەتارەکەم بووم، له نزیکه وێ، ژن و پیاوێ لە گڕ خۆشکردنی شوێنی هەڵدانی چادرێکی گچکۆکه بوون، چوار پێنج منداڵی سەرکەوبنکە، وەک بڵێی هاتبنه سەیرانێ، گەمەیان دەکرد، هاوڕێیەکەم لێپرسی:

تۆ خەریکی چی؟

پیاوەکه به بێزاریەوە:

گۆڕی خۆمان هەڵدەکەنین.

-گۆڕ!

ئێمه لێره پتر یەک بست هێوەتر ناچین، ئەگەر سوڕ بزانم لێره عیزرائیلمان دێته سەرێ.

گوتم:

ئەگەر دەمێنـــــنەوە، بـــــپەڕنەوه ئەو بەر، لە جـــــادە دوورکەونەوە، بڕۆنە دۆڵێ شەرەبۆت باشترە.

قسەکەی منیان بە گوێدا نەچوو، ئاوڕیشیان لێم نەدایەوە.

رێی هەڵاتنمان گرت و ئەوانیشمان بەجێهێشت، نەمانزانی

ئیزرائیل ئەو خیزانەی دیتەوە، یان نا.

لە بەردەباز لای بەردەکە رۆژ هێشتا باڵیکی مابوو، ژنێک بەرۆکـی پیـاوێکی گرتبـوو رایدەوەشـاند، دیـاربوو تـازە زانیبووی دایکی بە جێماوە:

+دەبێ بگەڕێمەوە، بێ دایکم یەک بستیدی ناڕۆم.

-گەڕانەوەی چی، تۆ شێتی؟

+ئا، شێتم، ئێوە بڕۆن من دەگەڕێمەوە.

ئاگـام لێیـان بـڕا، نـازانم چـۆن کەوتەوە، گەڕانەوە یـان دەگەڵ کۆچدا مانەوە.

لە ئاقاری پیرەرێ، لە نزیـک بەردە دواتـر نەخشـاوەکان، تووشـی مێگەلـێ بـووین، سـەرچێخ نەچـووبم هـی بـرای هاوڕێکەم بوو، مێگەلـیش لە ترسـی ئەنفـال بە گەل کـۆچی نەتەوە کەوتبوو، لەوێ بزنێکم گرت و بنە مەتارەیەک شیرم لێی دۆشی، هەرگیز لە چاکەی ئەو بزنە دەرناچم.

لە شۆڕبوونەوە لە دەو چەمەکە لە بەری هەرمۆتەوە تۆپێ هات و لە نزیک پردەکە کەوتەوە، هەزار ساچمەی لێبـۆوە، زوو خۆمـان لەگەل زەوی نەکردبـایە یەک، بە دەردی ئەو

کوڕە دەچووین کە نەمزانی چەند ساچمەی گرتەوە، هێندەم دیت بە لادا هات و خوێن بە بەژنیدا هاتە خوارێ، باش هات، ترومبێلێ بۆی راگرت، بە چوار دەستان خستیانە سەری و بە هەیبەسوڵتاندا هەڵگەڕا.

لەو دیوی هەیبەسوڵتان، سەرچیخ نەچووبم لەو جێیە بوو کە لە گەرمەی راونانی لەشکری ئەنفال لە خۆشیی ئازادبوونی شاری سلێمانی، یەکەم و دوا فیشەکی خۆشیم تەقاند، بۆ بیستنی ئەو تەقەیە، دەبێ (لە ناوزەنگەوە لۆ بابەگوڕگوڕ)بخوێنینەوە، ئەو ناوزەنگەی رەنگە بەشێ لەو کۆچوبارە بەوێدا تێپەڕێ، ئا لەوێ بوو، هەواڵی گرتنەوەی سلێمانی، پێوەربوونەوەی لەشکری ئەنفال گەیشت، بەو هەواڵە، بە تەواوی چۆکمان شکا.

با بگەینەوە رانیە، بزانین باسوخواسی ئەوێ چیە، هێشتا نەگەیشتبووینە کلکەی کۆڵین، ئەو کلکەیەی هەوری بارانـاوی لە کوێوە بێ، بەر لە هەر جێ بە سەر ئەوێدا شۆڕابە دەدا، لەوێ هەور زگی گەیاندە زەوی، رێژنەیەکی لێداین، دەتگۆت رێژنەی گوللەیە، باش بوو زوو لێیکردەوە دەنا کۆچ بن ئاو دەکەوت.

-١٠-

پیرێ بە زمانی بە ڕۆژوو

لە بەر باران نوێژی دابەستبوو

نزاکانی دڵۆپ دڵۆپ

دەکەوتنە سەر زەویی تینوو

هێی رانیە، کوو لەو خاکەلێوەیە بووینە سۆدرەی دنیایێ، سەد خۆزیم بە رەشەمێ، بە هەیڤێ لەوەو پێشێ، هەینێ گەرم گەرم وێنەی پشکۆی راپەرین گەرم، بە ناو سەرماو سۆلەدا چزەمان لێوە دەهات و لە راونانی لەشکری ئەنفال، تا گەیشتینە شاری گڕ ساردنەبووینەوە.

رانیە هەینێ دەروازەیێ بوو بۆ راپەڕین، بەڵام هەوکە دەروازەی ئاودیوبوونە، ئاودیوبوون بۆ دیوی نادیار، کوێ ئەو کۆچە دەگرێتەوە، ئەو کۆچە لە کوێ دەگیرسێتەوە؟

بارانێکە بە قسەی بە تەمەنێک بێ، پەنجا بەهار دەبێ ئاسمان هێندە بارانەی نەباراندووە، وەرە ببینە جادە و بان و کووچە و کۆڵانان ببینە، خەڵک لە ناو ترومبێل و لە پەنا دیواران لە بن نایلۆن و پارچە حەسیران هەلکورماون، لەشکری ئەنفالیش نەگات، برسێتی و سەرما دەستی خۆیان دەوەشێنن و کەس هێزی هەلکەندنی گۆڕیشی نامێنێ، من کە رانیەم وا دی، هێ لە خەیاڵی مردن چ خەیاڵێکیدیم بۆ نەدەهات.

دنیا رووی لێرە کردووە، تۆ بڕوانە، هەر بە چاوی من نا بە چ چاوێ دەروانی، بڕوانە، رانیە بە دەشتی بەرینی

بیتــوێنەوە، هێنــدە تەنگبــۆتەوە هەناســەبڕکێت پێــدەکەوێ، هەســتدەکەم کێوەکــان کێــوی کۆســرەت و ئاســۆس و کێوەڕەش وێکهاتوونەتەوە و کۆچوبار گۆڕەوشار دەدەن، لە سـیمای هەر کــێ دەڕوانــی، دەڵــێ کێوەڕەشــی بە ســەردا رووخاوە.

لە پێش بارەگایەک خۆمان دیتەوە، کەوتبووە پەرگە بە لای کێوەڕەشــدا ســەر رێــی دەربەنــد، بارەگــا لە ســەری دەڕژێ، لە سەر دەرگاش جێی پێیەکت نابێتەوە، هەندێ لەو پێشــمەرگانەی چەنــد رۆژ بــوو بــزرم کردبــوون، لەوێ بینیمــنەوە، لەوێ پــێکەوتم زۆر لە هاوڕێیــان رێــی پیرمــام و شــەقلاوەیان گرتــووە، چــاوم لە یەک دوو بەرپــرس گێــڕا، نەمدیتنەوە، لەوانەی لە هەولێرێ پێش هەمووان هەڵاتبوون و ئێمەمانانیشــــیان ئاگــــادارنەکردبۆوە، گەڕام بیــــانبینمەوە و سیاســـەتیان بـــکەم، بـــاش بـــوو نەمـــدیتنەوە، دەنـــا پـــیس تێکدەگیراین و شتێ دەقەوما.

قاسمی هاوڕێم زوو دایـک و بـاوکە پیـرەکەی دۆزیەوە، منـیش کەوتــمە گەڕان، بەلکـوو کەسـوکار ببیـنمەوە، بەڵام ماڵێ مە هەرێ وابـوو بە رێـی پیرمامـدا هەڵـێن، باوەڕنـاکەم رێیان بێرە کەوتبێتەوە.

دوای گەڕانێکی زۆر بە بن باراندا، لە نزیک بارەگاکە لە دەو جادە لە گۆڕاییەک ماڵی هەردوو خوشک و براکەمم دیتەوە، لە تەنیشت ریمیَ نایلۆن و مشەمایان هەڵدا بوو، بایشم لە ماڵیَ دابڕابوو، بەگەڵ وان کەوتبوو، لەو گۆڕاییەیَ ئەویَ گەڕەکیَ کەسوکار و ناسیارم لە بن باران دیتەوە، خاڵ و کوڕە خاڵ و ئەوانە، هەموو لە پەلەوەری ئاوەرووت و باڵندەی کەسیرەبوو دەچوون، لە راست ئەوانە خۆم بە شەرمەزار و چاو بەرەژێر دەزانی، وام هەستدەکرد لە سایەی سەری منەوە گەیشتوونەتە ئەو رۆژە رەشە، ئاخر منیش پنتێک بووم لە بەرە، ئەو بەرەیەی تەنها لە راو و رووت و هەڵاتن ئازایە.

بابم کز دیاربوو، دیاربوو ئازارێکی هەبوو، بەڵام بەسەر خۆی نەدەهێنا، ئەو پیاوە زۆر قایم بوو، مەگەر لە پیَ کەوتبا، دەنا لەشی پڕ برینیش با، خۆی نەخۆش نیشاننەدەدا، رۆژووەکەشی نەشکاندبوو، زۆر هەولیان لەگەڵی دا، بەلاش بوو، لە مردنێش ئەو وێنەم لە چاو رەشنابێتەوە:

لەو بەر بارانە، ئەها پارچە نایلۆنێکی بە سەر خۆی دادا، پارچە حەسیرێکی راخست، نوێژی دابەست.

کوڕێژگەییَ نەمناسیەوە هی کامیان بوو، سەری خستە بن گوێم:

ئاخر بڵێ، خودا میللەتێکی لەبیرکردووە، ئاگای لە نوێژی تۆیە؟!

گازاندەی خاڵە شەفیقیشم بیرناچێتەوە:

تۆ دەبوو بە ئێمەش بڵێی کە هەڵاتنمان لە پێشە، وات گوتبا، وام لە خۆم نەدەکرد، زوو خۆمان دەگەیاندە قەندیل.

گوتم:

منیش تا بەیانیەکەی هەڵاتن دڵنیا نەبووم...

گوتی:

با، بیستمەوە وات گوتبوو، خۆزگە بە منت دەگوت.

ئەو پیاوە زوو، لە سەردەمی پادشایەتیەوە دژی حوکمەت و ستەم چەکی هەڵگرتبوو، دوو سێ براشی لە سەر شۆڕش دانا، درەنگ لە بەزمی مەلایی و جەلالی تێگەیشت و لە ماڵی خۆی دانیشت، بەڵام دەتگۆ لە تیرەی هەڵۆیە چاوێکی هەر لە چیا و دوندی بڵند بوو.

هاوڕێکەم نازانم چۆن رێکیخست، دایک و بابی و بابمی خستە ناو ترومبێلێکەوە و بەرە و ناوزنگی بەڕێکردن، گۆتمە بابم:

تۆ لەوێ لە بارەگای ناوزەنگێ چاوەڕێکە، تا ئێمەش دەگەینێ.

کۆچ لێرەوەش سەریکرد، کەسوکاریش بەڕێکەوتن، من گەرامەوە بارەگای کۆمۆنیستان.

لێرەش(هەڵێ هات)ە، رانیە باردەکات و لە سەر چۆلبوونە، لە قسان لەشکری ئەنفال زۆر نزیکبووەتەوە، رێی دەربەند بەر ناکەوێ.

ئێمە هێشتا لە بارەگاین، چاوەڕێ دەکەین داخوا لەشکر دێ یان نا، ئەگەر هات، بەرگری دەکرێ یان نا؟ هەر کەسە و شتێ دەڵێ، کەس بە کەس نیە.

هاوڕێکەم لە من بە مێشکتر بوو، هاتە بن گوێم:

بە قسەی من دەکەی، دەڕۆین، با وەک هەولێرمان بە سەر نەیەت، رۆژەکەی رەشە، کەس بە کەس نیە، تڕومبێلێ رێککەوت خۆ تێدەکوتین، دەڵێی چی؟

بەر لەوەی وەڵامی بدەمەوە، هەندێ وردیلە سەربردە هەن، با لەبیرنەچنەوە:

لە سەرە کۆڵانێکی قولە بوو یان سەرا، ژنێ رووی لە دیوار پشتی لە من بوو، زۆر بەو دەچوو، هەوە، هەو نیە،

ڕەنگە هەوبێ، نزیکبوومەوە، هێشتا ئاوڕی نەداوەتەوە، ڕوویم نەدیوە، بەڵام دڵنیام هەوە، ئەو ژنەی لەو کاروانی کۆچە لە دوو جێ دیتم و نەمناسیەوە، دڵم دەڵێ، ئەو ژنە دەمناسێ و ناسینێکی باشیش، سەیرە من بۆ نایناسمەوە؟ هەر دەبێ، قسەی دەگەڵ بکەم و خۆی پێمبناسێنێتەوە، وا چاوەڕێ دەکەم ڕووی لە دیوار وەرگێڕێ و بمبینێ، تا چاکوچۆنی لەگەڵ بکەم، ئەها، ئاوڕیدایەوە، حەیف، هەو نەبوو، ئەو ژنە نەبوو کە دەبوو خۆی بە من بناسێنێتەوە، ئەوەش بووە سەرباری خەمان.

لەو شوێنەی ئەوێ ڕۆژێ ئەو ڕۆژەی ئێرە، ڕانیەی دەروازەی ڕاپەڕینێ، بە ناوی خۆیەوە کرد و لە شێوەی خەناوکەیێ لە ملی خۆی کرد، لەو شوێنەی کە دەستەیێ ئەمنیان بە سەری ڕمەوە کرد و تۆڵەی ساڵانێ سووکایەتی و خوێن و سەردەرێ و بەردەرێیان لێ کردنەوە، لەوێ پیاوێ لە چۆکی خۆی دەدا و بە دەنگی گەورە:

کوڕینە، ڕۆژی جوامێرانە، ڕۆژی دەستوەکەری و چوونە مەیدانە، هەڵمەیەن، حوکمەت بگاتەوە شار، ئەلێرە ورد و درشتمان بە سەری نێزەوە دەکات.

هـاواری دەکـرد و کەس گـوێی لێنەدەگـرت، هەمـوو خۆیـان بـۆ هەڵاتـن خڕدەکـردەوە، ڕۆژ ڕۆژی هەڵاتـنە، ئەو کەسـە ئـازایە، بەر لە هەمـووان دەگـاتە ئەودیـوی ئاقـاری لەشکری ئەنفال.

لە مزگەفتی گەورەوە هاتوهاوارە، درووشـم و سـروود و ورە وەبەردانە، بەڵام هەسـت دەکەم ترسـیان پێـوە دیـارە، لە ناو ئەی ڕەقیبیشەوە ترسم خوێندەوە، تینی گوێڕاگرتنم نەما، چوار پێنج پاکەتم بـۆ کـاتی پێویسـت کـڕی، ئەو کاتـانەی بـاران ڕێ لە پێچـانەوەی جغـارە دەگـرێ، بەرەو بارەگـا گەڕامەوە، ئەو بارەگـایەی وەک هەمـوو بارەگایـان لە سـەر چۆلکردن و بارکردن بوو.

ئێسـتا کێشـەی گەورە بەنـزینە، هەر ترومبێلـێ دەگـری، بەنزینی لە سەر تەواوبوونە، بەنزین قاتە مەگەر بە گوللە دەنا چـۆڕێ دەسـتناکەوێ، ئەوڕۆ ئەو ڕۆژەیە بەنـزین دە قـاتی خوێن گرانە، واز لە شەڕی بەنزین بهێنە.

مام بایز، ئەو پێشـمەرگەیەی دەتگـوت تاشـە بەردێـکە بە قەنـــدیلەوە و ڕەشـــەبای چ نســـکۆیێ لە جێـــی خـــۆی نەیجوولانـد، ئەو پیـاوەی بە(گوڵەسـتێرەکان...) نەوەسـتا، بە

هەندێ خۆ بە خەیاڵکردنەوە چووە ناو(خەوی پیاوەی قەندیل) و ناوی بووە پیاوە داغستانیەکە، لە بن گوێسووانەیێ چەک لە شان و لە شانی ژنەکەی راوەستابوو، جغارەیەکی وەک قامکی خۆی ئەستووری بۆ پێچامەوە، ژنەکەی پێمناساند و گوتی:

هێند لەمێژبوو نەمدیتبوو، بە شێوە نا، بە دەنگ ناسیمەوە، ئیدی لێی دانابڕێم، لەگەڵ خۆم دەیبەمە قەندیلێ.

مام بایز لە منی پرسی:

هاورێ بە من بڵێ، تۆ چۆن لەو هەڵاتن و خۆ نەگرتنە تێدەگەیت؟

گوتم:

مریشک چەندی تێدەگات، منیش هەر هێندە.

گوتی:

باوەڕناکەم بەو شێوەیە بێ.

گوتم:

مێشکم راوەستاوە و ئەوەی دەیڵێم هی دڵیمە.

گوتی:

وەک من تێیبگەم، دەستی سەرانی بەرەی تێدایە.

گوتم:

تۆبڵێی وا بێ؟ توانای دەستکردنەوە و بەرانگاربوونەوەیان هەیە و نایکەن؟

گوتی:

من وای بۆ دەچم.

گوتم:

باشە، لە پای چی وا دەکەن؟

گوتی:

دەیانەوێ نانی پێوە بخۆن.

گوتم:

چ نانێ؟

گوتی:

ئەو میللەتە نیوەی لەو دەشت و دەرە لە سەرما و برسا تیادەچەن، دوایوە سۆڤیەت یان ئەمریکا یان وڵاتێکیدی

لەسەرمان هەڵدەداتێ، هەینێ بەرە بەرەکەی دەخوات.

هاوڕێیەک هەڵیدایێ:

شتی وا نیە، بەرە شتی وا ناکات.

مام بایز:

ئەمــن چ لە سیاســەت و دنیــا تێنــاگەم، بەڵام ئەوەم لا روونە، سەرانی بەرە هەرچی خراپە لە دەستیان دێ.

لە بیرمنیە لە دڵێ خۆم بوو یان بە دەنگ گوتم:

خـوا بـکەم دنیـا لە سـەرمان بێـتە دەنـگ، قیرسـیا کێـی دەیخوات.

هــاوڕێیەک نــامەیەکی گەورەی کــراوەی دامــێ، لە دەســتخەتی ســەر بەرگەکەی زانــیم لە هەنــدرێنەوەیە، لە سوێدەوە، دەمێ بوو ناردبووی، ئێستا، لەو هەڵاتـنە دەگـاتە من، نـامە: لاپەرەیەکـی کچـکەی فرمێسـکاوی، لەگەل سـێ چـوار پەڕی گەورە، وتـارێ بـوو، خوێنـدنەوەیەکی ناسـک بوو بۆ سێ چوار شیعری من، خێرا چاوێکم پێـدا گێـڕا، لە نایلۆنێکم لوولدا و خستمە کۆڵەپشتەکەمەوە.

پیاوێکی خڕکەڵە قوتە بڕنۆیەکی لە شانە، پێنـاچێ زۆر بە تەمەن بێ، بەڵام برۆشـی داوی رەشـی تێـدانەماوە، ددانیشـی رەنگبـێ بـووبنە بەلاگیـڕی دیشـلەمە، پەرداخە چـایەکی بە دەستەوە، روو لە ئێمە دەڵێ:

دە فسێی هەمووتان بەم، پیاو کێوەڕەش لە پشـتی بـێ، بە دەربەندێدا هەڵدێ!

لە دڵێ خۆ گۆتم:

لە فسێم دەبەی ببە، من دەدەمەوە دەربەند.

-١١-

بە سەر کۆچبارا

باران لە پەلە ئاسن دەچێ

تیژ تیژ

لە لەش و گیان رادەچێ

سەر لە ئێوارەیە، بووە واتە وات و هەڵێ هات و هەرایێ کەس نەبوو هێ لە هەڵاتن بیر لە شتێکیدی بکاتەوە، گوایە لەشکر وا بەرەو رانیە دێ، لە قسان لە شارەزوورەوە تا ئێرە، لە گەرمیانەوە تا ئێرە، لە قەراجەوە تا ئێرە، لە بەری بەڕانەتیەوە تا ئێرە، تەنها ئێرە ماوە بکەوێتەوە ناو چەنگ و زاری لەشکری ئەنفال.

لەو ئێوارە هەڵاتنە، ئەو ئێوارەیەی مەگەر سپێدەکەی هەولێر وا بە سام و پڕ هاتوهاوار بووبێ، من هێندەم بیر ماوە، لەو گونیە مێوژە یان کشمیشەی لە بن بێرایییەکە دانرابوو، دوو سێ مستم کردە کۆڵەپشتەکەمەوە، خۆم لە ناو ترومبێلێ دیتەوە، ڕێی دەربەند، ڕێی هەڵاتنمان گرتە بەر، گوێم لە کەسێکیش بوو دەیگۆ:

هیچ لە گۆڕێ نیە، بۆ کوێ؟ حوکمەت چاوی بێرە ناکەوێتەوە.

کەسێکیدی دەیگۆ:

تێناگەم، هەر هەڵاتن و هەڵاتن، بۆچێ کەس بیر لە بەرەنگاربوونەوە ناکاتەوە؟ ئەو ماستە مووێکی تێدایە.

من به قسەی هاوڕێکەمم کرد و گوێمنەدایە ئەو قسانە و هەڵاتم، نەمزانی چەند کەس لە بارەگا مانەوە، چەند کەس پشتیان دایە کێوەڕەش، چەندیش وەک من ڕێی دەربەندی هەڵاتنیان گرتە پێش.

نەگەیشتبووینە دەربەند، لە ڕاست ئەو ڕێیە سەختەی پێچاوپێچ کێوی بەردینی کێوەڕەش دەبڕێ و دەتباتەوە دیوی سەنگەسەرێ، تاوێرێ لە چیا هاتە خوارێ، لە پێشە مە بە تەنکێشی ترومبێلێ کەوت و سووڕاندی، باش بوو وەرنەگەڕا، کەس لووتی بە خوێن دانەهات، بەڵام ترومبێل پەکی کەوت، ژنێک لە داخا یەخەی خۆی دادڕی و ڕوو لە ئاسمان:

خودایە، تێر نەبووی! سەدامت پێمانەوە نا، ئاسمانت پێمانەوە نا، شاخت پێمانەوە نا، بەسە، خودایە بەسە، تۆزێ بەزەیی.

پیاوێک لێی هەڵدەداتێ:

ژنێ، بە گژ خوادا مەچۆ، زارت خوار دەکات.

ژنە پتر تووڕە دەبێ:

با خواری کات، زارم ناوێت.

سەرنشـینان دابەزیـن و بە بـن بارانـدا قەدبـڕ دایـانەوە کێوەڕەش، نەمزانی تا کوێیان بڕی.

تـاریکە و باوبـارانە، لە سـەر تـڕومبێلەوە ئاومـان لـێ دەچۆڕێتەوە، لە کێوەڕەشەوە تا بن مامەندە، دیـوی قەنـدیل، تا ئەو شوێنەی تڕومبێـل ڕێـی کـرد، هـیچ وێـنەیەک، هـیچ گرتەیەک هیچ گۆتەیەکم بیرناکەوێتەوە، تەنها هێندە نەبـێ، بەو دیوەی گردی حوسنی تێپەڕین، ئەو حوسـنیە دەڵـێم کە سەردەمی بەرێ لە دەڤەری پژدەرێ مێـرێ مەیـدان بـوو تـا ئاوی لە دووی بێلی هات دەستی نەدا، تا مرد شەڕی ئاغـا و زۆرداریـی کـرد، سـەر ئەو گردەشـی بـۆ گـۆڕی خـۆی دیـاریکرد، بـۆوەی ئاغـا هەرچـۆنێ سـەرهەڵبڕن بیبیـنن، لەو دیوی ئەو گردەوە هەستمکرد قەڵادزێـی وێرانـی خشـتێ بە پێوەنەماوی هەناسـەبڕاو، جـوولەیەکی تێکەوتـووە، وێـدەچێ هەنـدێ خەڵـک بـۆی گەڕابـنەوە و لەگـڕ بـن هەناسـەی پێبدەنەوە، هێندە و تەواو.

دابەزیین و شوفێرەکە بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە.

ئەوشـۆ ئاسـمان کـونی تێبـووە، بـاران وەک کونـدەی سەربەرەژێر دێتە خوارێ، تیشە بەردێ، بنە دارێ، پەنایێ نیە

پەنامان بدات، باران بواری ڕۆیشتن نـادا، ڕێ و ڕێ تەواوێ ڕۆیشتین، پەنایێ نەبینینەوە، لە پێ دەکەوین.

ئێـرە ڕەنگبـێ ئاقـاری قەبـری عوسـمان بـێ، یـان کەمـێ هێـوەتر، بـاران و تـاریکی ڕێـی دیتنیـان تەواو داخسـتووە، چـاوی لایتیشـی بەسـتووە، بـۆیە شـوێن ناناسـرێتەوە، ئەهـا، سەرەتا وا تێگەیشتم لەتە شاخێ، ئەشـکەفتێکی مامەنـدەیە و داڕماوە و ڕێی گرتووە، لۆریەکی گەورە دەرچـوو، خـۆزی سەرداپۆشـراو دەبـوو، لۆریـان لەو ڕێـیە بەجێهێشـتبوو، هـاتە سـەرمان جـامەکەی بشـکێنین دەرگـای بکەیـنەوە، وامـان نەکرد، وا تێبگەم هاوکار بوو گوتی:

با بچینە بنی.

ئێمە ئێستا چوار کەسین، یەکیـان ناناسـم و نـایەتەوەبیرم کــێ بــوو، هاوکــاریش ئەو کــوڕە بــاڵابەرزەیە کە لە ناو(گوڵەسـتێرەکان) نـاوی پیتچـنە و پەنـجەی هەر بە سـەر تفەنگەوە نا، بە سەر زۆر وشەوە دیارە.

بـن لـۆری زۆر بڵنـدە، لە سـەر چـۆک کەوتیـنە جـێ خۆشـکردن، بەوەی باشـە جێـیەکە بەرزایـیە و هێنـدە ئـاوە نایەتەوە بنی، هێ لە هەندێش چەقینە، کەمێ قوڕ و بەردمان

هەڵـداوە و لە لەلای بەرزیەوە رێ ئاومـان گـرت، قاسـم دیـاربوو سـەرکەوتبووە سـەر لـۆریەکە بە دوو پـارچە حەسـیرەوە هـاتەوە، رامانخسـت و لە سـەری پـاڵکەوتین و کۆڵەپشتمان کـردە سـەرین چاومـان لە بـزن کـرد و بـۆ ئەو شەوە باراناویەماڵێکمان بۆ خۆمان چێکرد.

ئێستا جێمان خۆشە، نە ئاومان دێتەوە بن، نە بـاران لێمـان دەدات، جلکمان تەڕە، با تەڕ بێ، کێشە نیە، بەرە بەرە کـزر دەبێـتەوە، وێـدەچێ جێـی ئـێمە لە چـاو هـی ئەو خەڵـکە مێوانخانە بێ، ئەوشۆ داخوا چەند منـداڵ و پیـر لە سـەرما و برسا رەقهەڵاتبن.

بـاران لێناکـاتەوە، ئەوشـۆ دەنگـی بـاران ناخۆشـترە لە قرمژنـی گـوللەی سـەرباز و جاشـی ئەنفـال، ناخۆشـترە لە لوورەی تۆپی ئەنفال، ئەوشۆ ئەنفال بۆتە هەور و لەئاسمانێوە بە سەر کۆچوباری کوردان دادەبـارێ، چ شـەوێکە ئەوشـۆ، کەس نـا، تەنهـا پادشـا و سەرلەشـکر و تفەنگچـی ئەنفـال ببیینن.

رادیـۆکەی هاوکـار لە قسـە نـاکەوێ، بەڵام مـن لە بـن لۆریەکە نەماوم و خۆشم نازانم لە کـوێم، بـۆیە تێینـاگەم چ

دەڵێ، ئەو شەوە تەنها دوو سێ ڕستەی ڕادیۆم لەبیرە، نازانم مۆنتیکارلۆ بوو، یان جێیەکیتر، گوتی:

سوپای عێراق دەستی بە سەر هەموو شارەکانی باکووری عێراقدا داگرتووە و زۆری کوردیش بە دەشت و کێو کەوتوون و بەرەو سنوورەکان ڕەویان کردووە.

پاکەتم بۆ ئەوشۆ بەکەڵک هات، جغارە بە جغارە پێدەکەم، هاوڕێکانم دەڵێن:

هاییداربە، لۆریەکە ئاگر نەگرێ.

لۆری لە دەریا هەڵکێشراوە، برووسکەی ئەنفالیشی پێبکەوێ گڕناگرێ.

لە کەلێنی مژی جغارەوە دنکە مێوژێ، تۆ بڵێ کشمیشێ دەخەمە زارمەوە، هەرچەندە هاوڕێیەک زوو گوتی:

هەستدەکەم پیسە و تامی تێکچووە، بۆگەنی بووە، مەیخۆ.

لە زاری من خۆش بوو، دنکم لێبڕی و هەستم بە تام و بۆنی ناخۆش نەکرد.

ئەو شەو لەو ماڵە، ماڵی بن لۆری، شەوێکی درێژ شەو نا ساڵێک بوو، ساڵێکی باراناویی بێ پسانەوە، ساڵێکی کۆچ بوو، کۆچی نەتەوەیەک بۆ نادیار، ئەو شەوەی بن لۆری چەند جار مردن و زیندووبوونەوە بوو، دیتنی هەر وێنەیەکی گریاناوی کە دەهاتەوە بەر چاو مردنێ بوو، ئەو وێنانەش کە لە پێشمان بوون هێشتا نەماندیتبوون، مردنێ بوون، بۆ چەند جار مردنی خۆم لەو شەوەدا، دەبێ مژەکانی جغارەکانی خۆم بژمێرم، ناژمێردرێ، مردنەکانی خۆمم بۆ ناژمێردرێ، لێیگەڕێ.

ئەو شەوە ئاسمان چ هێرەیەکی بە ئێمە کرد، داخوا چ هێرەیەکی بە کۆچباری کورد کردبێ! ئێمە لە بن لۆریەوە تەنها خۆمان دیت، ئەو شەوە هێندەی لە پشیلەی دەرکراو، لە سەگی راونراو دەچووین نیو هێندە لە مرۆڤ نا، لە سەر تەنیشت خۆمان گرمۆڵە کردبوو، پشتی تەڕمان بە یەکتر دابوو، من خۆم بە جغارە گەرمدەکردەوە، شوفێرەکە ئەگەر ئێمەی لەو بارە دیتبا(خت خت و چەغە چەغە)ی لێدەکردین.

ماڵی ئەو شەوەمان ماڵی بن لۆری پڕپڕ وێنەی تاریکە و چەندی دەکەم ناکەونە بەر رووناکی گێڕانەوە و پێشاندانەوە، هاوڕێیەک ناوە ناوە دەیگۆ:

دەبێـت وریـا بـین، هەمـوو پـێکەوە خەومـان لێـنەکەوێ، شوفێر بێتەوە و هەڵیکات، پانمان دەکاتەوە.

مـن لەو قسـەیەوە ترسـی گەورەیـی لـۆریم لێدەنیشـت، رەچاوی ئەوەم دەکرد، نەکەومە راستی تایەکانی.

دەبێـت بـۆرژابم، سـەرخەوێکم شـکاندبێت، ئـاخر بـایی ساڵێ خەونی ناخۆشم دیت، خەونێ لەو خەونانە تا ئێسـتاش کە ئەو شەوە دەنووسمەوە، وەک ناو خەونەکەمم لەبیرماوە، خەونەکە بە خوشکی گەورەمەوە بـوو، لەو خەونە، هێنـدەی نەمـابوو بکەوێـتە بـن کەویە بەفـرێ، دەسـتی بە لـوولەی تفەنگەکەمەوە گرت و دەربازی بوو.

-١٢-

ڕۆژهەڵاتی دایک

ڕۆژهەڵاتی پەنا و دەرگا هەمیشە لە سەر پشت

باشووری بێ پشت و پەنای

لە شێوەی ساوای خۆی لە ئامێز گرت

دنیا رووناکی تێکەوتووە، هەورەکەی هەڵپرینگاندووە، چیاوچۆل دەڵێی لە دەریا هەڵکێشراوە، زەوی ڕەباس بووە، ئێرە بناری مامەندەیە، لەو بەرەوە قەندیلی سەرکەش لە داخی ئەو کۆچوبارە کز دیارە، لە چاوی منەوە کز دیار بوو، ئێرە چەندان ترومبێلی لێ ڕاوەستاوە، ئاخر لێرەوە ڕێی پێیان دەستپێدەکات، ئەگەر ترومبێلێ زۆر بەکێش بێت و بنیشی بڵند بێت، تفەنگهاوێژێکیدی دەڕوات، بەڵام لەوسەر هەردەبێ بە ڕێی خۆیدا بگەڕێتەوە، چوونکێ نێوان باشوور و ڕۆژهەڵات گیراوە، ڕێی تایە نامێنێ، ڕێ هەوراز و لێژ و تەلان و چۆم و ڕووبارە، ئەوەی هەیە ڕێی پێشمەرگە و قاچاخچی و کەر و بارە.

زۆر کەس ترومبێلیان بەجێهێشتبوو، بە پێیان ملی ڕێیان گرتبوو، زۆر کەس لە ناو ترومبێل، لە پشتی ترومبێل، لە بن پارچە حەسیر، مشەما، نایلۆن، تەشکەبەڕە هەڵکوڕمابوون، هەندێ ترومبێلیش لە سەر گەرانەوە بوون، بگەڕێنەوە و بدەنەوە ئەو ڕێیەی دەچێتەوە دەستی چەپی قەندیلێ، ڕێی حاجی ئۆمەرانێ، تا لەوێوە ئاودیوی ڕۆژهەڵات بن، ڕۆژهەڵاتی بن دەستی عەجەمان، هی ناو ورگی ئێرانێ.

ئێرە ئەو شوێنەیە چوارپێ بەهای چوارتایە دەشکێنێ،

هێستریّ سەد لۆری، نێرەکەر سەد تراکتۆر و ماکەر سەد قەمەرە دەهێنیّ، ئەوە نەبوو پیاوێک لەگەڵ قاچاخچیەک لەگژ سەودای سۆپەر بە بەرزە بوون!

لێرەوە رۆژ رۆژی قاچاخچی و کۆلکێشانە، هێستر دیّ و منداڵ و پەککەوتە و بزگورِ باردەکات و باژۆ، منداڵ لە ناو تێرِکەوە تەنها سەریان دیارە، دەڵێی کەروێشکی زارەتریکی تاساون، کۆلکێش هەیە، باری هێسترێکی لە خۆی بارکردووە، ئەو رۆژە لەو رێوبانە ناوی هێستر گۆرِا بۆ تاکسیی کێو و بەندەنان، بە کرێیەکی کەم خەڵکیان لە هەورازان سەردەخست، خەڵکیان دەگەیاندە ناوزەنگ و نۆکانیّ، بەڵام تێیاندا هەبوو زۆر پرِکێش و چاوچنۆک بوو، زۆری دەویست و بە کرێی کەم کەسی هەڵنەدەگرت، هەشبوو کرێی وەرنەدەگرت، بۆ کوردی هاوخوێن و خودای خۆی دەکرد، کورِیّ ناوێکی وەک مەولوودی هەبوو، پێشتریّ دەمناسی، کۆڵبەرێکی هەژار و نەدار بوو، پارەی هێسترێکی نەبوو کاروانی پێبکات، ئەو کورِە دوو دوو، سیّ سیّ منداڵیّ لە کۆڵ دەکرد و دەیخستنە بن هەنگڵیەوە و لە جۆگەی دەپەرِاندنەوە و لە هەورازانی سەردەخستن، جانتا و کۆڵیّ لە ژنان وەردەگرت و نەخۆشی

له پشتێ دەکرد، باری هێسترێکی له خۆی بار دەکرد و بـــۆی دەگەیانـــدنه جـــێ، جغارەیەکیشـــی له کەس وەرنەدەگرت، چەند شیرن دەیگۆت:

مـــن نـــۆکەری هەمووتـــانم، هەمـــوو کـــورد به کـــۆڵ دەپەڕێنمەوە.

هەشبوو کوشتەی ئەو بیست و پێنج دیناریه سووره بوو که له دوورەوە وێنەیەکی کەشخەی سەدام بریسکەی دەدا، گوێم لێبوو خودان هێسترێ به کەسێکی دەگوت:

سەدامێکی سوورم بدێ، دەتگەیەنمه قاسمەڕەشێ.

ئێ، له سەودای قاچاخچیان گەڕێ، به من ناگێڕدرێتەوە.

تـــۆ وەره لێـــره لەو ڕێوبـــانه له بنـــاری مامەنـــده به دیـــوی قەنـــدیل، ئەو قەنـــدیلەی مەگەر تەنهـــا ئەو بەری لەشـــکری ئەنفال بگرێ و نەهێلێ پتر بێـــته پێشـــێ، وەره، ببیـــنه میللەتـــێ سـەری خـۆی هەڵگرتـووە، به چیـا کەوتـووە، کۆچوبـاری کورد ببیـنه، کۆچبـاری سـەرمابردەڵه، برسـی، پێخواسـی تـا چۆک له قوڕ هەڵکێشراو، کۆچوبـارێ خـۆی نـازانێ ڕووەو کوێ قەتارەی بەستووە.

قەندیل ئاسمانێ قەتارەی قازوقورنگانی دیتووە، زەویێ قەتارەی بنیادەمی دیتووە، بە سەریدا، بە لاپاڵ و بناریدا کۆچیان کردووە، بەڵام لەوتەی هەیە، لە سەردەمی ئەسکەندەرەوە تا دەگاتەوە پەلامار و هێرشی لەشکری عارەب و عەجەم و رۆم، قەتارە وکۆچوباری لەو شێوەی رۆڵەکانی خۆی بە خۆیەوە نەدیوە، کۆچێکە لە کۆچی چ کۆچێکی ناو دیرۆک و ئەفسانە و ئایینان ناچێ.

ئەمن زوو زوو دەکەوتمە خەیاڵەوە و لە کۆچوبار دادەبڕام و هێند دوور دەڕۆیشتم هێند قوول رۆدەچووم، بە دیمەنێکی جەرگبڕ، هاوارێکی بریندار نەبایە نەدەهاتمەوە ناو کۆچ، هاوار و وێنەی ئەو پیاوەم هەرگیز بیرناچێتەوە، ئەها ببینە:

بە هەردوو دەستان لە سەری خۆی دەدات و بە دەنگێک کە ئەشکەفتەکانی مامەندە دەنگیدایەوە:

تایەکانم، تایەکانم، ئەی هاوار تایەکانم...

تا ژن و منداڵی گەیاندبووە دیوی رۆژهەڵات، هەر چوار تایەی ترومبێلەکەیان دزیبوو، لە جێی تایە چوار بەردی قیتیان دانابوو.

وا دیاره هێزی پاتار گەیشتە تایەش.

گرتەکانی ئەو ڕێیە، گوتەکانی ئەو ڕێیەی کۆچ بە هەزار کامێراش پێشاننادرێنەوە، لە دەستی کێ دێ؟ چ کۆچنووسێ، چ ڕۆمانووس و فیلمسازێ ئاه و ناڵە و فرمێسکی ئەو کۆچە بنووسێتەوە، بۆ دیتنی دڵۆپە فرمێسکەکانی ئەو ڕۆژەی کۆچ، دەبێ لە وەرزی توانەوەی بەفر بێین بە دیار قەندیلەوە لە دیوی هەتاوەوە دانیشین و وردبینەوە.

من لەو ڕێوبانە لەو کۆچە هەر لە بن قەڵاتەوە تا ئێرە تا بن مامەندە، زۆر گرتە گریاندوومی، بەڵام فرمێسکەکانم یان خۆم یان باران دەمانشاردەوە، کەس نەیدی، لێ لە ئاست ئەو گرتەیە فرمێسکەکانم ئاشکرابوون، ڕەنگە دەنگیان لەگەڵ بووبێ، بۆیە تۆ بە چاوی خۆت، بە هی من نا، چاودێ، ئاخر هی من لێڵە و باش نابینێ:

پیاوێک سێ منداڵی هەڵگرتووە، منداڵێ بە کۆڵەوە دوو بە باوەشەوە، ڕووی کردە ئاسمان:

خودایە، تۆ لە کوێی؟ گوێت لێمە؟ لە دەست ئەو سەدامە فیرعەونەمان بپارێزە، ئەو کوردە موسڵمانەی خۆت

له ریزی جوو بژمێره، تێداچووین، مووسایه‌کمان لۆ بنێره.

هاوکاری پیتچن له کاتی وه‌رگرتنی منداڵێ له‌و پیاوه‌ی به خودای گوت مووسا بۆ کورد بنێرێ، فرمێسکی منی دیت، گوتی:

هاوڕێ، پته‌و به، ئه‌وه‌ش تێده‌په‌ڕێ.

ژنێک کۆڵێکی گچکه‌ی به کۆڵه‌وه و ده‌سته‌کانیشی له ده‌ستی دوو منداڵ، سه‌ری بۆ ئاسمان هه‌ڵبڕی و وه‌ک ئه‌وه‌ی له ناو چاڵێکی قووڵه‌وه ده‌نگ هه‌ڵبڕێ:

له عه‌رده‌وه له‌شکر، له عاسمانه‌وه له شکر، خودایه به‌سه، ئه‌و غه‌زه‌به به‌سه.

پیاوێک پێده‌چێ گوێی له به‌سه به‌سه‌ی ژنه‌که بووبێت، وا باگۆیدایه‌وه:

پشت له خودا مه‌که، خودا پشتت تێناکات، خودا که‌سی بێکه‌سانه، کلاوی بۆ بەڕووش درووستکردووه.

قاسم له به‌ر خۆوه ده‌ڵێ:

به‌ڵام بۆ کورد هیچی چێنه‌کرد.

تەماشـــای ئاســـمان دەکەم، لە ســـەری مامەنـــدەوە بەری ڕۆژاواوە سێ چوار پەلە هەور دەستی یەکگـرتن بـۆ یەکتـر درێژ دەکەن، لەو ڕۆژە چ وێنەیـێ هەیە وێنەی یەکگرتنـی پەلە هەوران کرێـــت و خوێنتـــاڵ، مەگەر تەنهـــا لەشـــکری ئەنفال.

دوورنـیە لە بەر خـۆمەوە نـزام خوێنـدبێ، ڕەنـگە ڕوو لە ئاسمان گوتبێتم:

مەبارێ، باران مەبـارێ، کـاروانی کـوردان وا لە ڕێ، بە دەشـــت و شـــاخ و داخەوە، هێنـــدەی دڵـۆپی درەشـــتی تـــۆ، فرمێسک بە چاوی ژنانی ساوا بە ئامێزەوە، مەکوژە، ئاسـمان مەکـوژە، نەوەیـێ سـاوا مەکـوژە، ئەوەی بەردەسـتی ئەنفـال نەکەوت، تۆ مەیکوژە.

هەر لەو هەورازەیە، دایکێـــک لە چـــاوی مـــنەوە خـــۆی منداڵ بوو، هی ئەوە نەبوو لەو تەمەنە ببێتە دایک، لانکی بە ســاواوە بە کـۆڵەوە بـوو، دیـاربوو ئەوانەی لەگەڵـی بـوون دەیانویست لانکەکە بەجێبهێڵێ، گوێم لێیە دایکـی منـداڵەکە دەڵێ:

کۆرپەکەم لە ناو لانک نەبێ خەوی لێناکەوێ، دەمرێ.

لە هەورازەکە سەرکەوتین بە دەستی چەپ گۆڕایی بوو، هەندێ ترومبێل راوەستابوون، لە ریمێکەوە کەسێ بە ناوی خۆم هی پێشمەرگایەتی نا، گازیکردم، نەمناسیەوە، چووم، کەسوکار دەرچوون، خوشکی ناوەنجیم(رەحیمە) ئەوەی دایکم بە منداڵی بە کابانە ژیکەڵە گازیدەکرد، نەخۆش کەوتبوو، گوتی:

وا هەناوم دەسووتێ، بۆ پتە سماقێ، کووزە لیمۆیێ.

ئێ خوشکێ، بە من بڵێ لە کوێت بۆ پەیدابکەم؟ لەو ناوە گەڕام، زۆر گەڕام بۆ پنجە ترشۆکەیێ، نەبوو، گوتم:

گوندمان لە سەر ڕێیە، بگەینێ، پەیدا دەبێ.

بەجێمهێشتن، هەرێ وابوو ئەوان بگەڕێنەوە و بە ڕێی سەنگەسەردا ڕێی بەرەو سنوور بگرنەوە، بەڵام وایاننەکردبوو، کەمێ دوای من، بە ڕێی مندا ڕێی کۆچیان گرتبوو.

لە بن بنەدارێکی دەو ڕێ، خێزانێ بە پاڵ یەکەوە دانیشتبوون، پیاوێک لە بن دارەکەوە:

هەر باش بوو لێرەم دیتنەوە...

من نەمناسی، هاوڕێکانیشم نەیاناناسی، سڵاومان کرد و بە گەرمی وەریگرتەوە و گوتی:

ئێوە پێشمەرگەن، وا نیە؟

چاوەڕێی وەڵامی نەکرد، گوتی:

بە سەری ئێوە نا، بە سەری خۆم، لە ودیوی قەرچووخەوە هەڵاتم تاگەیشتمە ئێرە، ئێرە قەندیلە کوێیە؟ چاوم بە یەک پێشمەرگە نەکەوت، ئەریٚ ئێوە بە بن زەویدا هەڵاتن، یان بە ئاسماندا؟

کەسمان بە کەرتکە وشەیەکیش زمانمان نەگەڕا، ژنەکە روو لە پیاوەکە بە تووڕەییەوە:

چیشت بەو قوڕ بەسارانەیە، لۆ گێچەڵیان پێدەکەیت؟

کابرا هەستا و هاتە لامان، چاکوچۆنی کرد و سەر و کولیچەیەکی داینیٚ و گوتی:

من لە ناو پێشمەرگایەتی کوڵاوم، لە لێقەوماندا سەرکردە و بەرپرس زوو دەقووچێنن، لێم تووڕە مەبن.

سوپاسی قسە و کولیچەکەمان کرد، ویستی سەر و

کولیچەیدیشمان بداتێ، لێمان وەرنەگرت، بەر لە ماڵاوایی گوتی:

+ من ئەو ناوە هەموو شارەزام، لە ناوزەنگەوە تا پشتئاشان و ئەودیویش، بە من بڵێن، سوپای عێراق ئەگەر بگەڕێتەوە ئێرە، تا کوێ تخوبی ویە؟ بۆوەی بگەمە ئەوێ.

- بگە ئاقاری شێنێ، پشت ئەو بەرزاییە، پشتی لێبکەوە.

شێنێ، لە دوای ئەنفالی هەشتاو هەشت تا ئەو کۆچە، تاقە گوندی دیوی باشوور بوو کە بە پێوە مابوو، لە بن دەستی پێشمەرگە بوو.

لێرەوە ترسی لەشکر نامێنێ، بەڵام کۆچوبار راناوەستێ و رێ و بزنەڕێ دەبڕێ، ئاخر ترسی سەرما و برسێتی هیچی لە ترسی ئەنفال کەمتر نیە، خەڵک ئەو چەند نووردووە نانەی لەگەڵ خۆیان هێنابوویان لە تەواوبوونە، ئاسمانیش دەگرمێنێ و دەبرووسکێنێ، بۆیێ چ جار نیە دەبێ بگاتە قاسمەڕەش و لەوێوە لە دەرگای رۆژهەڵات بدات، داوای پەنادان و حەوانەوەی لێبکات، ئەگەر پاسدار دەست بە رووییەوە نەنێ.

هەورازی ژیان و نشێوی تەمەن لەبیرینەبردبمەوە، لە

هەورازەکەی ئەو دیوەی شێنێ بوو، دیمەنی ژنێک کزەی لە جەرگمەوە هێنا، کۆڵێ بە کۆڵیەوە دەستی منداڵێکی پێنج شەش ساڵەی بە دەستەوە، تاکە پێڵاوێکیش بە دەستی منداڵەکەوە، ژنە بە تاکێ پێڵاوەوە بە پێی کیسەڵ لە پێش من بەو هەورازەدا هەڵدەگەڕێ، خۆم گەیاندە تەنیشتی:

-کۆڵەکەتم بدێ، تا...

+ئەوە تۆی؟

-تۆ...

کێ بێ باشە؟

نۆبەرەی دایە و بابە، خوشکی گەورەم (عەیشۆک) ئەوەی بابم زۆری خۆشدەویست، گریان قورگمی گرت، کۆڵەکەم لێوەرگرت و نەمهێشت فرمێسکەکانم ببینێ، هەورازەکەمان بڕی، لەوێ لە هاوڕێکانم جیابوومەوە و لەگەڵ خوشکم مامەوە، پێڵاوەکەی لە لایەکەوە هەڵتلیشابوو، بە پێوەی گیر نەدەبوو، دەبوو بە شتێ ببەسترێ، سەرم هێناو برد و چاوم گێڕا، لە دۆخینەکەی خۆمم باشتر دەستنەکەوت، لە بەختی من، دۆخین زۆر درێژە، دوو بست

پترم لێبڕی و پێڵاوم توند پێچا و توانی پێی بڕوات، لەوێ بێنێکمان دا و منداڵەکانیتریشی گەیشتن، خوشکی گەورە گوتی:

تۆ بڕۆ ئێمە هێواش دێین، تۆ بگە بابم، بیبینەوە.

گوتم:

خەمی ئەوت نەبێ، دڵنیام ئەو ئێستا لە بارەگای ناوزەنگە و جێی گەرمە.

گوتی:

خەونم پێوە دیوە، زوو بیگەیێ.

بە شێوەیێ قسەی دەکرد، ترساندمی، هەیپەم لێکرد.

لەسەر ئەو جۆگەیەی لە بەفر و کانیاوی مامەندەی سەر بە تەمەوە دێ و شێنێی دڵنشین لە شێوەی سێوی بەرواریان دەکاتە دوو کەرتی جوان، شازادەی شێنێم دی، بۆ ناسینەوەی ئەو ژنە، لە ناو (گوڵەستێرەکان...)ەوە لە(پایزی شێنێ) وردبنەوە، لەوێ لە سەر جۆگە بە بەرانپیلێ نانەوە راوەستاوە، نان بۆ رێبوارانی برسی رادەگرێ، هاتە سەرم

نانێکی لێوەرگرم، پەژیوانبووەمەوە، خۆم لێی لادا، وا تێبگەم ناسیمیەوە.

لە رێ هەستمکرد پێچ بە زگمدا دێ، شەقاو دوای شەقاو ژانی پتر دەبێ، مێوژی بن لۆریەکەم بیرکەوتەوە، گەدەم ژەهراوی نەبووبێ! گوێم نەدایە زگم تا ناو بارەگای ناوزەنگی سەرێ ئاورم نەدایەوە، ئەو بارەگایەی مانگێک لەمەوبەر مالی چەند پێشمەرگەیێ بوو، ئێستا پرە لە ژن و منداڵ، لەو ساتە هەورێکی رەش لە شێوەی عەبا لە بناری مامەندەوە دابەزیبوو، بەو رۆژە شەوی بە سەر ناوزەنگدا هێنابوو، بەڵام بارانی دەگەل نەبوو.

لەوێ بە پرسیار پێکەوتم بابم لە سەری سەرەوە لە هۆدەیەکە، هێشتا چەند هەنگاوێکم مابوو بگەمە سەر دەرگا، دووکەل هەناسەمی گرت، ترسام، نایلۆنی سەر دەرگام لادا، چرە دووکەلێکە نەبێتەوە، گازمکرد:

بابە، بابە

بە کۆخە وەلامی دامەوە، روو لە سۆبە پشتی بە دیوار دابوو، هێنامە دەرێ، کەوتە قسە:

باش بوو هاتی، تازە کەمێ بۆرژام خەونم بە ئێوەوە دی.

سـۆبە دارەکە، دانەگیرسـابوو، خنکـابوو، دەرگاکەشـی کرابـۆوە، چەنـدی هەوڵـم لەگەڵیـدا رۆژووەکەی بشـکێنێ، نەیشکاند، گۆتم:

بابە، رۆژی بە جغارە دەشکێ؟

گوتی:

ئەوجا ئەوە قسەیە، کوو ناشکێ!

گوتم:

جغارە دووکەڵ نیە؟

گوتی:

با

گوتم:

تۆ بایی سەد جغارە دووکەڵت هەڵمژیوە.

گوتی:

هی مـن حەزی تێـدانەبووە، نەشـکاوە و نایشـکێنم، وازم لێبێنە.

ملی نەدا و نەیشکاند.

بـابم زۆر لە خەمـی دایکـم و منـداڵەکانیتری بـوو، بە هەناسە هەڵکێشانەوە پرسی:

هەواڵێکی دایکت و وانت نەزانی؟

بە درۆیەک هێندە دڵیم خۆشکرد، بزەیەکی شیرن کەوتە سەر زاری، گوتم:

لەبیرمچـوو زوو پێـت بڵـێم، ئەوانیـان لە رێـی ئەولاوە لە سەر سنوور دیوە.

گوتی:

توخدا بە راستتە؟

گوتم:

بابە، خۆ درۆت لەگەڵ ناکەم.

لە دڵێ خۆ گۆتم:

چ دەبـێ ئەو درۆیە درۆ نەبێـت و ئەوان ئێسـتا ئـاودیوی رۆژهەڵات بووبن.

هێی دایێ، ئەو چێژەنەشمان وێکڕا نەکرد، بیـرمکەوتەوە، دەستی لە ملم کردبوو، دەیگۆ:

ئای کوڕەکەم، تۆ بۆت دەژمێردرێ ئەوە بووە چەند جەژن تۆ لە ناومان نی؟ برنج و قەیسیمان بێ تۆ خواردووە؟ ئەو جەژنەی دێ تۆڵەی هەمووی دەکەینەوە، خودایە، خودای لە سەر سەران، ئەو کوردە تا سەر سەربخە و چیدی لێکمان دامەبڕێنە، چیدی کوڕەکانمان بە دەشت و کێو مەیەخە.

هێی دایێ، ئەو جارە هەر کوڕەکان نا، میللەتێ ورد و درشت بە کێوان کەوت، پەڕاکەندە بوو.

لەو ساتە زۆر بیری برا گچکەکەم کرد، پاشەبەرەکە ئەوەی ئەوێ ساڵێ لە ساتی بە چیاکەوتنم هۆڕ هۆڕ لە دوام گریا، ئەو رۆژەش کە لە رۆژی ئازادی گەڕامەوە شار و ماڵێ نەمناسیەوە، ئەو برایەی کەسەرە بە جەرگمەوە، کەسەرێ ناهێتە ڤەگێڕان و گۆتنێ.

کۆچوبار دێ و ناپسێتەوە، کەسوکار گەیشتن و بابم بەگەڵیان کەوتەوە و بەرەو قاسمەڕەش بەڕێکەوتن، بازگەی پاسداران کەڕەسیسەیە و تا نۆرەت دێ، زۆرێ دەوێ، بارانیش لێناکاتەوە، لەوێ لە سەر ڕێ، لەو گۆڕە لە دەو رووبارەکە، خەڵک خۆیان داوەتە بن مشەما و پارچە حەسیر و گونیە و ئەو شتانە، بابم لە بن پارچە نایلۆنێ، لەبیرمنیە بە چی فتاری کردەوە.

نـۆرەی پەڕیــنەوە بەرەو رۆژهەڵات هــات، کەســوکار پەڕیــنەوە، منـیش گەڕامەوە بارەگـا، بەر لەپەڕیـنەوە کـوڕە پلک (حوسێن) ئەوەی دواتر، دوو کـوڕی بـوونە گـۆری و بەڵاگێڕی ولات، دەمانچەیەکی دامێ و گوتی:

کاتی خۆی خـۆم رادەسـتکردەوە، بەڵام ئەو دەمـانچەیەم نا، با لات بێ، ئیدی کارم پێینەما، ئەگەر فرۆشرا، بیفرۆشە.

ئەو دەمانچەیەی پازدە شازدە ساڵ بوو، لە ناو گۆڕ بـوو، بە زینـــدوویتیش مـــابۆوە، دوای وەی لە ئاشـــبەتاڵەکە گەڕابۆوە، لە حەوشەی مـاڵێ قـۆرتێکی لێـدابوو، بە هەنـدێ فیشەکەوە جوان تەقەتـی کردبـوو، لە یەکەم رۆژی ئـازادیی شار، لە گۆڕی دەردەهێنێ، تەقەی پێدەکات.

خاوەن تفەنگەکەی شانیشم گوتی:

ئەگەر پێویستت پێی نەما و پارەی کرد، بیفرۆشە.

خوشکی گەورەشم بزەیەکی شیرنی بۆم کرد و گوتی:

دوو بستە دۆخینت قەردارم.

-١٣-

لەو كوچبارە

ژنێ هەبوو ویتام دەكرد

درەنگ ناسیمەوە

چوو، مەگەر لە خەونێ ببینمەوە

ئێستا لێرەم، لە بارەگای ناوزەنگی خواریێ، ئەوەی کەوتۆتە سەر رێ، رێی کۆچی نەتەوە، من لە پەنای بەردێکەوە کە کەوتۆتە بەری رۆژهەڵاتی جۆگەکەوە، هێندە دوور نا لە رێ، لە کۆچوبار دەڕوانم، رووی خۆی پێشاندانم نیە، لەو رۆژە لە پێشمەرگە چاوبەرژێرتر دەبێ کێ بێ؟ هێی، باجی (نا بۆ بندەستی) چەند قورسە، نەتەوە چ باجێکی دا، باجێک لە دیرۆکی نەتەوان بێ وێنەیە، کۆچی مووسا و جوو، شتێکی لێ شینبوو، لێ کۆچی کورد داخوا...

ئەو جۆگەیە لەمامەندەوە دێ و دەرژێتە ئەو رووبارەوە کە لەوێوە دەبێتە تخووبی رۆژهەڵات و باشوور، ئەو تخووبەی بەغدا و تاران کێشایان، جۆگەکەش تخووبە، هەرکێ لەو کاروانە نەپساوەیە دێ و لە جۆگە دەپەڕێتەوە کاتێ دەبیستێ پێی ناوەتە ئاقاری رۆژهەڵات، لە سەر برسێتی و ماندوویێتی هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵدەکێشێ، هەناسەی دەرچوون لە چنگی لەشکری بەغدا.

هەندێ وێنەی ئەو رێیە بەبیر خۆم دەهێنمەوە:

چاوم لێیە، بەتەمەنێ لە سەر بەردەبازێ پێی خزی و

کەوتە نــاو جــۆگە، کــڵاو و جەمەدانــی ئــاو بــردی، هەڵیانســتاندەوە، گــوێم لێنەبــوو، پــاش کەمــێ بیســتمەوە، گوتبووی:

مەمگرنەوە، با تەرمەکەم بگەڕێتەوە، مـن دەزانـم عەجەم لە عارەب باشتر نین.

پیاوێـک لە جـۆگە پەڕیەوە، لە سـەر بەردێ دانیشـت، دەسـتی بە ردێنـی داهێنـا و بە ئامـاژەی دەسـت سوپاسـی خودێی کرد و گوتی:

باش نەبوو نەکەوتینە دەستی سـەرباز و جـاش، مردیشـم مەمبەنەوە بن دستی وان.

من لێرەم لە دەو ئەو جۆگەیەی تخووبم، پێشـتریش لێـرە بـووم، بە رۆژ و شـەو بژمێـرە، رێـک بەر لە یەک مانـگ لێرەوە بەڕێکەوتم بەرە و کێوەڕەش، بەرەو راونانی لەشکری رەشــی ئەنفــال کە هێنــد بەغــار بــوون، بە پێــی بــاش نەیاندەگەیشـتینێ، لە رەشـەمێی پـڕ بەفـری ئێـرەوە هەیپەمـان لێکــرد و لە نــاو گــڕی بــابە گوڕگــوڕ لە یەکەم شــەوی خاکەلێوەی ئەوێ گیرساینەوە، تۆ بەری خۆ بـدێ، رۆژگـار چۆن دەسووڕێ، چەنـد زوو بە ڕێـی خۆیـدا دەسـووڕێتەوە،

لەشکر راوینـاین و هـاتینەوە جێـی خۆمـان، مـن لێـرەوە بە شەش رۆژ گەیشتمە سـەر قەڵات و بـن منـارە، لە رێگـاش وێنەی پەنگری داربەڕوو دەگەشامەوە، لەوێشـەوە بە حەفـت رۆژ هاتمەوە ئێرە، نـاوزەنگی کـۆنە هەوار، لە رێگـاش هەر خۆم دەزانم چۆن دەکوژامەوە و دەبـوومە خـۆڵەکەو، ئێسـتا لێـرە بە کـوژاوەیی بە دیـار کـۆچی نەتەوەیەکەوە دامـاوم، کەلکـی هـیچ نـاگرم، بە چیلکەیەکـیش نـابم، هێنـدەم لە دەستدێ، ئەو کۆچە وێنە وێنە لە چێوەی دیدەم بگرم و بـۆ رۆمانێک لە خەیاڵم دایانبکەم، ئێستا تەنێ سێ چوار وێـنەی سەر ئەو جۆگەیەی سنوور پێشاندەدەمەوە:

ژنێـک لە شـێوە نەختـێ لەو ژنە دەچـوو کە دڵنیـابووم دەمناسی بەڵام بەو دوو سێ جار دیتنەش نەمناسـیەوە، ژنە لە سەر جۆگە هێشتا نەپەڕیبۆوە، چاوێکی بە لای ئێمەدا گێـڕا، تێگەیـی بارەگـای پێشـمەرگەیە، بە دەنگێـک ئەوەی خـۆی کەڕ نەکرد بیستی:

دەک بەسەرتاندا بڕووخێ، بۆ خۆیان جێیان گەرموگوڕە، ئەو خەڵکەشەیان بە دەشـت و کێـو خسـت، لە برسـان و لە سەرمان مردن.

لە دڵێ خۆ گۆتم:

لە جێی تۆ بم، لەوە پتر دەڵێم.

ژنێکیدی بە دەنگێکی نووساوەوە:

ئەنگۆ بە من بڵێن، مەسعوود لە کوێیە؟ جەلال لە کوێیە؟

ژنێکـــیش کە لەدواوە دەســـتی خســـتبووە بەر پشـــتێنی پیاوێک، ئاوڕی لە بارەگا دایەوە، بە هەناسە هەڵکێشانەوە:

دایکتان کوێر بـێ، ئەو هەمـوو سـاڵە چـۆن لێـرە ژیـاون! گورگی لێ ناژی.

کۆچی کوردان لە باشوورەوە بۆ رۆژهەڵات بنـی نـایە و ناپسێتەوە، بە هەوراز و نشێودا، بە رێی کەروباردا دێـن و لە جۆگەی ناوزەنگ دەپەڕنەوە، لێرەوە لە نۆکانەوە رێ دەبێـتە راستەڕێ، ترومبێلیشی پێدا دێ، لێرەوە نە ترسـی لەشـکری بەغدا دەمێنێ، نە لە برسا مردن.

لە رۆژهەڵاتەوە، رۆژهەڵاتـی بـابە تـایەری هەمەدانـی و خانـای قوبـادی و مەسـتوورە و وەفـایی و هـێمن و هەژار و حەسەن زیرەک و پێشەوا و سـمکۆوە، نـان دێ، نـاوە نـاوە ترومبێلێ بە نانەوە دێ، لەوێ ئەو تلیـانە نانـانەم بیـرکەوتەوە کە بەر لە نەورۆز، ژنانی هەولێر دەیانخستە ناو ترومبێلەوە بۆ

ئازادیی کەرکووکیان بەڕیدەکرد، ئەوە بوو ئازاد بوو، بەڵام هەر حەفتەیەک تەمەنی بوو، ئێستا لە رۆژهەڵاتەوە بۆ کۆچوبار دێ، کۆچوباری بەر شاڵاوی بەغدای هەمیشە نەیار.

لێرە دوا وێنەی کۆچی سەر جۆگەی سنوور پێشاندەمەوە، دوایوە منیش دەپەڕمەوە:

ژنێک جانتایەکی گەورەی بە شانەوە، نەگەیشتە سەر چاڵەکە، رووی رووەو بارەگا وەرگێڕا، لەو دوورەوە دوو چاوی گەش بەو رۆژە بەو هەور و لێڵە دەتگوت ئەستێرەی سیوەیلن، دۆڵیان رووناککردەوە، ئەو ژنەیە من بە دوایدا وێلم و نایناسمەوە، لێرە لەو سەر جۆگەیە ناسیمەوە، سەیرە، لەو ساتە چی وای کرد بیناسمەوە؟

وای لە سەر و سیما چەند گۆڕابوو، هیچ ژنێ بە هەشت نۆ دە ساڵ بەو شێوە ناگۆڕێ، ئەگەر حەفت کۆستی کەوتبێ و حەفت کۆچی وەک ئەو کۆچەی دیتبێ، وا ناگۆڕێ، من نەبێ کێ دەیناسێتەوە!

لە بن بەردەکە هاتمە خوارێ، بەرەو لای وی چووم، ئەو پەڕیەوە و منی نەدی، بە دوایدا چووم، تا نۆکانی خوارێ لە

دوای چووم، بەڵام چەندی کردم، زاخم نەکرد خۆمی پێشانبدەم و بڵێم:

من تۆم ناسیەوە، تۆش من دەناسیەوە؟

خۆزی لە دۆخێکی ئاسایی دەمدیتەوە نەک لە کۆچدا، هەینێ دەچوومە بەر دەمی و پێمدەگۆ:

من تا رۆژی پەسڵانێ لە چاکەت دەرناچم، ئێستاش چێژی تۆ لە زارمە.

من ناسیمەوە، ئێوەش ئەگەر ویستتان بیناسن، برۆن ئەو سەرە کۆڵانەی (کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە) ببینن کە یەکەم ژوان و یەکەم ماچ و یەکەم ...ی من پێشاندەداتەوە.

برۆ، ژنەی خەیاڵیی ناو خەیاڵ، برۆ، لەگەڵ کۆچا برۆ، بە رۆژهەڵاتی پەناگە و نانبدەت دەسپێرم، بە نیازی دیدار.

ئەو رۆیشت و من گەڕامەوە و ئیدی نەمدیتەوە، تا گێڕانەوەی ئەو کۆچە نەمدۆزیوەتەوە.

هەندێ گرتەی ناو بارەگا دەگێڕمەوە، پاشان دەچمە رۆژهەڵات و بە دوای کەسوکاردا دەگەڕێم، بە تایبەتی دایکم و ئەوان، نازانم دەرچوون یان نا.

-١٤-

چەک، ماڵاوا

بە دوای کۆچی یاراندا دەچم.

بارەگـا دارمـاڵە، هەمـوو لە نـاو یەک دەخەون، جێـی پشیلەیەکیش نابێتەوە، جیّ تەنـگە و منـیش زگئێشـە تەنگـی پێهەڵچنیوم، کوڕیّ هەستیکرد نەساغم، گـازیکردم، هەنـدیّ پرسیاری لێکردم و سیّ چوار دەنـکە حەبـی دامـیّ، دکتـۆر لوقمانیـان دەگـوّتیّ، لەویّ زانـیم بـرای ئـارام شـاهێنە، ئەو شاهێنەم لە چیـای هەوریّ ناسـی، لە ئەنفـالی ئەویّ سـالّیّ لە بەری بەسـتی شـەرغە لە شـەڕی سـەرباز و جاشـان، خـۆی کردە گۆریی نیشـتمان، حەیـف و سـەد مخـابن، ئەو چەنـد رۆژەی ئازادیی نەدی، لە خۆی خەنـی! کـۆچی کـوردان و قووچانی بەرەی نەدی، من کەزانیم ئەو کوڕە برای شـاهێنە، لە خۆوە خوێن بزووت و خۆشمویست.

لێرە نانخۆری جێگـرم، وا چـاکە بـکەومە دوای کـۆچ و داکم و وان ببیـنمەوە، تفەنـگ و دەمـانچەکەم فرۆشـت، چ زۆرە قاچـاخچی چەک زۆرە، هەنـدیّ پێشـمەرگە هەر زوو بـوونە قاچـاخچی، لە بـن دەسـتیان دەرهێنـام و پـارەکەم بـۆ خاوەنەکانیان خستە گیرفانمەوە.

لە سـەر رۆیشـتنم، هەواڵ هـات، لە بـن سـەفینە شـێتە لە دەربەندی کۆڕیّ، پێشمەرگە بەرسـینگی لەشـکری ئەنفالیـان گرتووە و شەڕ گەرمە و لەشکر لە شکانە، خۆزی زووتـر و

له زۆر جێیتـریش بەرەنگـاربوونەوە دەبـوو، ئەگەر لە بـن کێوەڕەشیش ئەو هەواڵەم بیستبا، دوور نەبوو بگەڕێمەوە، تازە ڕۆیی، بۆ چەک ناگەڕێمەوە و بە دوای کۆچدا دەچم.

کۆڵەپشتم کردەوە، هێ لە کیسەی تووتن و نـاڵەی جودایی، هیچم نیە لەگەڵ خۆمی ببەم، ئاخر ئەو نـاڵەیە لە جغـارە تونـدتر گرتبـوومی، نەمـدەتوانی دەسبەرداری بـم، دەبوو لەگەڵم بێ.

وایـش! ئەوە چی بەسەرهاتووە؟ نـاڵەی جودایی بۆتە هەویری ڕەقهەڵاتوو، پەڕەیەکی نەماوە کـۆپلەیەکی بخوێنـدرێتەوە، حەیـف و هەزار مخـابن، مـن نەبـووە لەبیرمبچێ جوان تەقەتی بکەم، نـایلۆنێکی لێنەپێچم، ئەو ناڵەیەی بەفر و بارانی سۆران و بادینـان تەریـان نەکرد، ئەو ناڵەیەی کوێستان و گەرمیانی کرد، ئەو ناڵەیەی ئەنفـال لێی جودا نەکردمەوە، بارانی ئەو کۆچە، وشە وشە تواندیەوە.

وتارەکە تەڕ نەبووبوو، دوو جـارم خوێنـدەوە، خستمەوە ناو کۆڵەپشت و بە سنگێکی دیوارەوە هەڵمواسی و گـۆتمە هاوڕێیەک:

چاوێکت لێبێ.

دەڕۆم، بە دوای کۆچوبـاردا، بە سـۆراخی کەسـوکاردا
دەڕۆم، ئەگەر چ بەڵا نەیەتە رێ، هێندەم پێنـاچێ دێـمەوە و
دەچمەوە شـەقلاوێ، لەوێ، لە بەری سۆرکەوە، گەڕانەوەی
کۆچ دەگێڕمەوە، لەوێ هەندێ وێـنەی تـاڵانوبڕۆی بەرەیـێ
پێشـاندەدەمەوە، تـاڵانوبڕۆیێ لە هـیچ چەتەیەکـی دەریـا،
چەتەیەکی سارا، لە هیچ چەتەیێ ناوەشێتەوە، بەرەیێ وڵاتـی
رووتکردەوە، میللەتی رووتاندەوە.

# بە ڕێی کۆچبارا

من لێرەم لە دەو ئەو جۆگەیەی تخووبم. پێشتریش لێرە بووم. بە رۆژ و شەو بژمێرە. رێک بەر لە یەک مانگ لێرەوە بە ڕێ کەوتم بەرە و کێوەڕەش. بەرەو راوانی لەشکری رەشی ئەنفال کە هێند بەغار بوون. بە پێ باش نەیاندەگەیشتینێ. لە رەشەمێی پڕ بەفری ئێرەوە هەیپەمان لێکرد و لە ناو گڕی بابە گوڕگوڕ لە یەکەم شەوی خاکەلێوەی ئەوێ گیرسساینەوە. تۆ بەری خۆ بدێ. رۆژگار چۆن دەسووڕێ. چەند زوو بە ڕێی خۆیدا دەسووڕێتەوە. لەشکر راوینان و هاتینەوە جێی خۆمان. من لێرەوە بە شەش رۆژ گەیشتمە سەر قەڵات و بن منارە. لە رێگاش وێنەی پەنگری داربەڕوو دەگەشامەوە. لەوێشەوە بە حەفت رۆژ هاتمەوە ئێرە. ناوزەنگی.

دەبوومە خۆڵەکەو. ئێستا لێرە بە کوژاوەیی بە دیار کۆچی نەتەوەیەکەوە داماوم. کەلکی هیچ ناگرم. بە چیلکەیەکیش نابم. هێندەم لە دەست دێ. ئەو کۆچە وێنە وێنە لە چێوەی دیدەم بگرم.

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication